# «برایەتی»

## یەکەمین رۆژنامەی رۆژانەیە لە مێژووی رۆژنامەگەریی کوردی دا

لێکۆڵینەوە و بیبلۆگرافیا

نووسینی
**ئەژاد عزیز سورمێ**

پێشەکی
**فەرهاد عەونی**

چاپی دووەم
١٩٩٧

نەژاد عەزیز سورمێ

# «برایەتی»
# یەکەمین ڕۆژنامەی ڕۆژانە
# لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی دا

لێکۆڵینەوە و بیبلۆگرافیا

# «برایەتی»

# یەکەمین ڕۆژنامەی ڕۆژانە
# لەمێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی دا

لێکۆڵینەوەو بیبلۆگرافیا

نووسینی

**نەژاد عەزیز سورمێ**

پێشەکی

فەرهاد عەونی

چاپی دووەم

١٩٩٧

* «برایەتی»
یەکەمین ڕۆژنامەی ڕۆژانە
لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی دا.
* لێکۆڵینەوە و بیبلۆگرافیا.
* نووسینی: نەژاد عەزیز سورمێ.
* چاپی یەکەم ـ کوردستان ـ ١٩٩١
ـ هەروەها لە گۆڤاری (یەکگرتن) ـ هەندەران ـ ١٩٩١.
* چاپی دووەم: کوردستان ـ ١٩٩٧ بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی «برایەتی».
* نەخشەی بەرگ و دەرهێنانی هونەری: نووسەر.
* کۆمپیوتەر: شکار نەقشەبەندی.
* چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە ـ هەولێر

* برایەتی
رۆژنامەیەکی سیاسی رۆژانەیە.
* خاوەنی ئیمتیاز: حبیب محمد کەریم.
* سەرنووسەر: دارا تۆفیق.
* شوێنی دەرچوون: بەغدا.
* مێژووی دەرچوونی ژمارە (٠) - ١٩٧٤/١/١.
* قەوارە: (تابلۆید).
* ژمارەی لاپەڕەکان: (٨) لاپەڕە.
* مێژووی داخستنی: ١٩٧٤/٢/٨.

# پێشەکیەک دەربارەی خوولەکانی ڕۆژنامەی برایەتی

**فەرهاد عەونی**

ڕووناکبیرانی کوردیش وەکو ڕووناکبیرانی هەر نەتەوەیەکی دیکەی ئەم سەر زەمینە دەمێکە خولیای ئەوە بوون کە کوردیش ببێتە خاوەن ڕۆژنامەو گۆڤارو لە دونیای شارستانییەتدا چی دیکە بەجێ نەمێنێ، بەڵام هیواو ئاواتی ئەو ڕووناکبیرانە وەکو خەون وئاواتی سەرکردەو پێشەوایەکانی ئەم نەتەوە ستەمدیدیە زیندەبەچاڵ دەکران چونکە بارودۆخی سیاسی ناوچەکەش لەو سەردەمەدا هەمووی هەر بە دژایەتی کردنی کوردو ئامانجەکانی تەواو دەبوو کاری چاپەمەنی و ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردیش لە بارودۆخی سیاسی کوردی لەو سەردەمەدا بە هەمان شێوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرا وەک چۆن کێشەی سیاسی کورد ڕەفتارو هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرائەمە لەلایەک و لەلایەکی دیکەشەوە نەبوونی چاپخانە و ئامێری چاپ لە سەراپای کوردستاندا خۆی لە خۆیدا هۆکارێکی دیکەی دواخستنی لەدایک بوونی چاپەمەنی کوردی بوو سەرەڕای نەبوونی هۆشیاری ئەوتۆلە کۆمەڵگای کوردەواریدا لە ئاکامی بەردەوامبوونی ژێر دەستی کوردو پارچە پارچەبوونی وڵاتەکەی و پاشکۆیەتی باری ئابووری بەو وڵاتانەی کە کوردستانی پێوە لکێنراوە کە هیچ کاتێک یاریدەدەرو هۆکاری پەیدابوونی چاپەمنی کوردی نەبوون و مرۆڤی کوردیش بە ناچاری فێری نووسین و خوێندنەوەی بە زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی بووە کە ئەویش بووە هۆی پەیدابوونی چەندین ڕێنووس کە تا ئێستەش لەگەڵدا بێت ئاسەواری بە ئاشکرا ماوەتەوە.

یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیش لە مێژووی نەتەوەی کوردا لە قاهیرەی پایتەختی میسر دوور لە وڵاتی کوردان چاوی هەڵهێنا ئەمەش خۆی لە خۆیدا ئەوە دەسەلمێنێ کە داگیرکەرانی کوردستان بەکوردیان ڕەوا نەبینیوە کە لە وڵاتی پان و بەرینەی خۆیدا مارەی دەرکردنی تاکە ڕۆژنامەیەکی بە زوبانی کوردی هەبێت بۆیە مقداد مدحەت بەدرخانی پێشەوا ناچاربوو یەکەم ژمارەی «کوردستان»ی نۆبەرەی ڕۆژنامەی کوردی لە٢٢ی نیسانی ساڵی١٨٩٨ لە قاهیرەی دور لە وڵاتی کوردان بە چاپ بگەیەنی و بەم دەست پێشخەرییەش یەکەم بەردی بناغەی ڕۆژنامەگەریی کوردی دانا بۆیە تاکو کوردو ڕۆژنامەگەری کوردی مابێ ٢٢ی نیسانی هەموو ساڵێک وەکو ڕۆژێکی پرشنگدار ڕۆژنامەنووسانی کورد ئاهەنگی تایبەتی بۆ دەگێڕن.

لە پاش دەرچوونی (کوردستان)ی نۆبەرە بە دەیان و سەدان ڕۆژنامەو گۆڤار هاتوونەتە دونیای ڕۆژنامەگەری کوردی و هەر یەک لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە ڕۆڵ و تایبەتمەندیی خۆی هەبوو و لە کات و ساتی خۆیدا کەم یا زۆر خەزمەتێکی گەورەی ئەدەب و زمان و ڕۆشنبیری و کولتووری کوردی کردووە سەرەڕای بایەخێکی زۆری هەندێ لەو ڕۆژنامانە بە دنیای سیاسەت و کێشەی کورد داوە کە تارادەیەکی زۆر بۆتە رووی گەش کێشە ڕەواکەمان وەئەگەر بێت و لێکۆڵەوەرێکی بە وێژدان لاپەڕەکانی هەندێ لەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە هەڵبداتەوە ئەوا بە ڕاشکاوی بۆی بەدەردەکەوێ کە تا چ رادەیەک ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانە بوونەتە تۆمارگایەکی بەنرخی مێژوو و ئەدەب و زانست فۆلکلۆری کوردی سەرەڕای خزمەتێکی گەورەی زوبانی کوردی و کێشەی ڕەوای گەلەکەمان.

ڕۆژنامەی (برایەتی)یش وەکو یەکەمین ڕۆژنامەی ڕۆژانەی کوردی ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە لەم بوارانەی کە لەسەرەوە باسی لێوەکراوە و تارادەیەکی زۆریش سەرکەوتووانە وەکو ڕۆژنامەیەکی کوردی پارتی دیموکراتی کوردستان ئەرکەکانی خۆی بەجێهێناوە سەرەڕای ئەو کۆسپ و تەگەرانەی هاتۆنەتە ڕێگەی بە هۆی ئەو بارودۆخە سیاسیە ناهەموارەی کە لە ماوەی ئەم(٣٠) ساڵە دووچاری گەلەکەمان هاتووە هەر لە داخستنی چەند جارەی وەدەست بەسەر داگرتنی کەلوپەلو ئامێرەکانی لە قۆناغە جیاجیاکاندا تا دەگاتە سووتاندنی ژمارەی٢١١٥ ڕۆژی٢٥/١٢/١٩٩٤ و داگیرکردنی بارەگای دەزگای ڕۆژنامەنووسی برایەتی و خەبات لە ڕۆژی٣١/١٢/١٩٩٤ لەلایەن یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە کەبووە هۆی دروست بوونی گیروگرفتێکی زۆر لە بەردەوام بوونی دەرچوونی ڕۆژانەی برایەتی بە شێوەیەکی ڕێک و پێک، بەڵام سەرەڕای ئەم بارودۆخەش نووسەرو کارمەندانی برایەتی بەوپەڕی لەخۆبووردنەوە سەرەڕای ئەو حاڵەتە نائاساییەش توانیان پاش ماوەیەکی کەم دەست بەکاربنەوە ئەوەبوو ژمارە٢١١٩ی لە ڕێکەوتی ١٧/٢/١٩٩٥ دا لە شارۆچکەی سەلاحەدین جارێکی دیکە کەوتەوە بەردەست خوێندەوارانی خۆشەویستەوە.

برای ڕۆژنامەنووس و ڕووناکبیر کاک نەژادی عەزیز سورمێ لە ڕۆژانی پاش ڕێکەوتنامەی یانزەی ئازاری ساڵی١٩٧٠وە پەیوەندی لەگەڵ ڕۆژنامەی برایەتی هەبووە و نووسینی زۆریشی تێدا بڵاوکردۆتەوە لە پاش ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی١٩٩١یش نامیلکەیەکی بە پێزی لەسەر ڕۆژنامەی برایەتی بە ناوی «برایەتی یەکەمین ڕۆژنامەی ڕۆژانەی کوردی» خستە بەردەم خوێندەوارانی کوردەوە کە بەم کارەی خزمەتێکی گەورەی ڕۆژنامەی برایەتی و ڕۆژنامەگەری

کوردی کردووه بابەتەکەش شیکردنەوەیەکی بابەتیانەی ئەو ٢٧ ژمارەیە کە ژمارەی سفری لە ١/١/١٩٧٤ و ژمارە یەکی لە٨/١/١٩٧٤ کە بە شێوەیەکی رۆژانە ٢٧ژمارەی لێ دەرچووە تاکو لە رۆژی ٨/٢/١٩٩٤ بە فەرمانێکی قەرەقوشی راگیرا.

لێرەدا ئەوەی بە پێویستی دەزانین روونی بکەینەوە مێژووی دەرچوونی رۆژنامەی برایەتیە هەر لە رۆژی دەرچوونی یەکەم ژمارەی لە رۆژی٦/٥/١٩٦٧ تاکو رۆژانی ئیمرۆیە کە تێدا برایەتی بە چەندین قۆناغدا تێپەڕیووەو ئەو خولانە دەست نیشان بکەین کە تێیدا دەرچووەو راگیراوە بۆ ئەوەی سەرجەم خوێندەوار و رۆژنامەنووسانی کورد سوودی لێ وەربگرن بەو هیوایەی توانیتمان شتێکی بچوکمان لە مێژووی یەکەمین رۆژنامەی رۆژانەی کورد تۆمار کردبێ بە تایبەتی لەم رۆژانەدا تەمەنی ٣٠ ساڵە تەواو دەکات.

**خولەکانی دەرچوونی رۆژنامەی برایەتی**

**خولی یەکەم:**

بارودۆخی سیاسی پاش بەیانی ٢٩ی حوزەیرانی ساڵی١٩٦٦ کە ،لە نێوان سەرکردایەتیی شۆڕش و پارتی دیموکراتی کوردستان حکومەتی (عبدالرحمان عارف)ی سەرکۆماری ئەوسا مۆرکرا زەمینەیەکی نەختێ لەبار هاتە ئاراوە بۆ دەرکردنی رۆژنامەیەکێ لە شاری بەغدا ئەوەبوو رۆژنامەی التاخی کە یەکەم ژمارەی لە رۆژی ٢٩/٤/١٩٦٧ دەرچوو، لە هەمان کاتیشدا بڕیار لەسەر ئەوە درا کە پێویستە رۆژنامەیەکی کوردیش بە ناوی (برایی) وە دەربچێت بۆ ئەوەی بەشێک لەو (بۆشاییە) پڕ بکاتەوە کە ئەو کاتە هەستی پێ دەکرا بە هۆی کەمی یانەبوونی رۆژنامەیەکی کوردی کە تەعبیر لە رای شۆڕشی کورد بکات ئەوەبوو دوای حەوت رۆژ لە دەرچوونی (التاخی) (برایی)یش یەکەم ژمارەی کە لەگەڵ ژمارەی هەشتی التاخی لە رۆژی٦/٥/١٩٦٧ کەوتە بەردەستی خوێندەوارانەوە. بەو شێوەیەی خوارەوە:.

تایتلی رۆژنامەی برایی بەو شێوەیەی خوارەوە بوو

**برایی**

رۆژنامەیەکی رۆژانەی سیاسی یە

خاوەنەکانی ئیمتیاز

سەرۆک نووسەری لێپرسراو : **صالح یوسفی**

دەستەی نووسەران

**ئەندازیار شوکت عقراوی**

**پارێزەر حبیب بابان**

**محمد سعید جاف**

**عبدالله سعید**

ژمارەی یەکەمی برایی بە هەشت لاپەڕەوە دەرچوو نرخیشی ٢٠ فلس بووە و ئیدارەکەش یەکەم جار لە شاری بەغدا ناوچەی (السنک)بووەو لە چاپخانەی (الشعب) چاپکراوە.

مانشێتی ژمارە یەکی بەخەتێکی رەش لەسەرەوەی تایتلی نووسراوە(با بشەکێنەوە ئاڵای برایی بۆ پێکهێنانی یەکسانی تەواو و یەکێتی ئاسایش لە هەموو عێراقدا).

مانشیتی ژێر تایتلەکەش بەم شێوەیە بووه، سەرۆک کۆمار وەلامی پرسیارەکان نەداتەوه.
بارزانی پیرۆزبایی لە برایی نەکات، لەگەل دوو وێنەی سەرکۆمار عبدالرحمن عارف لای راست و وێنەی بارزانی لەلای چەپ و ژمارەی دووەمیش رۆژی یەکشەمە رێکەوتی ۱۹٦۷/٥/۱۳ لەگەل ژمارە ۱٥ی (التاخی) بە ٦ لاپەرە دەرچووه پەیامیش لە نەخشەمان گۆڕدراوە بۆ (رێڕەوی برایی) لاپەرەکانی خولی یەکەمی برایی بە شێوەیەکی رێکو پێک وەکو هەموو رۆژنامەکانی ئەو سەردەمە رێکخراوە کە تێدا ئەم ناونیشانانەی بە هەمیشەیی تێدا هاتووه لاپەرەیەکی هەمیشە لەگەل رێڕەوی برایی دەنگوباسی جیهانی تێدا بلاوکراوەتەوەو لاپەرەی دووەمیش تەرخان کراوە بۆ هەوالەکانی ناوخۆ لاپەرەکانی دیکەش ئەو بابەتانەی لە ناسێنر گرتووە، ئەدەب، وەرزش لە هەفتەیەکدا، لەگەل جووتیارو کرێکاراندا، بە هەشتی مندال و نافرەت، کورد لە مێژوودا چیرۆکی ژمارە، ئەوانەی لەبیرناچنەوه، پۆستەی خوێندەواران، کوێ باوەڕ، سەرەڕای بلاوکردنەوەی وێنەی دیمەنە رازاوەکانی کوردستان.
شایانی باس کردنە لە ژمارە حەوتەوە ئیدارەی برایی گوێزرایەوە بۆ (باب الشرقي، بالەخانەی منیر عباس، نهۆمی سێیەم) ولە هەمان ژمارەدا برایی بە چوارلاپەرە دەرچووەو دەکەوتە بەردەست خوێندەوارانە بە هۆی ئەو بڕیارەی کەلە لاپەری هەمان ژمارەدا راگەیاندراوە کە (میری بڕیاری دا کە لەمەودواوە رۆژنامەکانی عێراق بەچوار لاپەرە دەرچن).
لە خولی یەکەمدا کە سالێک وشەش مانگ و سێ رۆژی تەمەنی بۆ۷۲ ژمارەی برایی دەرچووه.
گەرانەوەی بەعسیەکان بۆ حوکمی عێراق بە هۆی کودەتای ۱۷ی تەمووزی سالی ۱۹٦۸ بوو بە هۆی پەشێوی بارودۆخی گۆڕەپانی سیاسی لە عێراق بە تایبەتی رەنگدانەوەی سەلبی ئەم رووداوە زیاتر لەسەر کوردستان ئاشکرا تربوو بۆیە هەر لە سەرەتاوە خەریکی خۆئامادەکردن بوون بەنیازی سەپاندنی شەرێکی قورستر بەسەر گەلی کوردستاندا ئەوەبوو پاش سێ مانگ بڕیاری راگرتنی هەردوو رۆژنامەی التاخی و برایی یان دا، ئەوەبوو کە دوا ژمارەی برایی لەو خولەدا لە۱۹٦۸/۱۱/۹ دەرچووه.
شایانی گوتنە ئەو۷۲ ژمارەیەی برایی رۆلێکی کاریگەری هەبووه چ وەکو رۆژنامەیەکی کوردی خاوەن هەلوێستی بیری کوردایەتی پیرۆزی هەلقولاو لەبیری و سیاسەتی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە چ لە رووی بلاوکردنەوەی ئەو بابەتە مێژوویی و ئەدەبە کوردیانەی کە بۆ یەکەمجاربوو رۆژنامەیەک بە ئاشکرا گرنگیەکی تایبەتی بەم جۆرە بابەتانە بدات.
ئەو بابەتە بە پیزانەی کە لە بوارە جۆربەجۆرەکاندا بلاوی دەکرایەوە و کەلێنێکی گەورەی لە بۆشاییە پر کردبۆوە و بە تایبەتی لەو رۆژگارە دا.

**خولی دووەم ـ قۆناغی یەکەم**

پاش رێکەوتننامەی یانزەی ئازاری سالی۱۹۷۰ کە لە نێوان سەرکردایەتی شۆرشی ئەیلول حکومەتی بەغدا مۆرکرا کەش و هەوایەکی دیکە هاتە ئاراوه، پارتی دیموکراتی کوردستان بە سەرۆکایەتی بارزانی ئەمر پێشرەوایەتی تەواوی گەلی کوردستانی دەکرد سەرەڕای بەشداربوونی بە پێنج وەزیر لە حکومەتی مەرکەزی کە بارودۆخێکی تازەی بۆ ژیانی سیاسی گەلی کوردستا

دروست کرد و رەنگدانەوەیەکی ئیجابیانەی تەواوی لە هەمووبوارێکدا دروست کرد  کە یەکێک لەم بوارانەدا بواری رۆشنبیری بوو کە تێیدا چەندین گۆڤارو رۆژنامە چ لە کوردستان و چ لە بەغدا دەستیان بەدەرچوون یا بە دەرچوونەوە کرد کە یەکێک لەمانە برایەتی بوو کە خولی یەکەمی لە١٩٦٨/١١/٩کۆتایی پێ هاتبوو.
برایەتی لە خولی دووەمی رۆژی یەکشەممە رێکەوتی ١٩٧٠/٦/١ دەست پێ دەکات ونەگەر بەراووورد بکرێ لەگەڵ خولی یەکەمی چەند گۆرانکارییەکی بەسەرداهاتووە کە ئەمانەن:
* یەکەم: ناوەکەی لە (برایی)ەوە گۆردرا بۆ برایەتی.
* دووەم: شێوازی دەرچوونی لە رۆژنامە بوو بە گۆڤار.
* سێیەم: سەرنووسەری تا ژمارە١١ مامۆستا علی عبدالله بوو پاشان مامۆستا دارا تۆفیق بوو بە سەرنووسەری.
* چوارەم: شوێنی دەرچوونی لەم خولەدا بەغداو سلێمانی بوو.
* پێنجەم: جارێکی دیکە هەر لەم خولە لە گۆڤاردو گۆردراوە بۆ رۆژنامە.
* ژمارە یەکی خولی دووەمی برایەتی بە شێوەی گۆڤار لە بەغدا گەرەکی (المسبح) دەردەچوو لە چاپخانەی (الزمان ) چاپ دەکرا و هەر ژمارەیەکی بەرگێکی رەنگاورەنگی هەبوو دیمەنێکی نەشەنگی کوردستانی بەخۆیەوە دەگرت و بەرگی ژمارە یەکەمی دیمەنی قەڵای هەولێر بوو کە لە ژێردوی نووسراوە (نیشانەی خۆراگرتنی نەتەوەی کوردە).
ژمارە یەکی تاکو ژمارە١١ لە بەغدا دەرچووە کە خاوەنی ئیمتیازی مامۆستا حبیب محمد کریم و سەرنووسەرەکەی مامۆستا علی عبدالله بو بەڵام لە ژمارە١٢وە کە لە نیسانی ساڵی ١٩٧١دەرچووە گوێزراوەتەوە بۆ شاری سلێمانی و سەرنووسەرەکەش گۆردراوە بۆ مامۆستا دارا تۆفیق.
لەقۆناغی یەکەمی خولی دووەم ١٤ ژمارە گۆڤاری برایەتی دەرچووە بەو شێوەیە:.
ژمارە١ ساڵی ١ لە رێکەوتی١٩٧٠/٦/١ دەرچووە تاکو ژمارە ١١ کە لە شوباتی ساڵی ١٩٧١ لە بەغدا دەرچوودو ژمارە ١٢و١٣ی ساڵی یەکەم و ژمارە ١ ساڵی ی دووەمی لە سلێمانی تا حوزەیرانی ساڵی ١٩٧١ بەردەوام بووە.
**خولی دووەم - قۆناغی دووەم**
وەکو لە پێشەوە باس کرا ژمارە یەکی ساڵی دووەمی گۆڤاری برایەتی کە دوا ژمارەی گۆڤاری برایەتی بوو لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ١٩٧١ لە سلێمانی دەرچوو کەوتە بەردەستی پەیوەندیدارانەوە، واتە لە قۆناغی یەکەمی خولی دووەمدا تەنها ١٤ ژمارە لەم گۆڤارە دەرچووە لە بەغداو سلێمانی بەڵام پاش دوومانگ جارێکی دیکە برایەتی وەکو رۆژنامەیەکی هەفتانە دەستی بەدەرچوون کردۆتەوە کە ژمارەی یەکەمی لە١٩٧١/٩/١١ هەر لە شاری سلێمانی چاپکراوە و بڵاوکراوەتەوە بە (٨)لاپەرە، بەردەوام بووە تاکو ١٧ ژمارەی ئەو هەفتەنامەیە کە دوا ژمارەشی لە رۆژی١٩٧٢/٣/١٨ بڵاوکراوەتەوە.
شایانی باسە لەوماوەیەدا (برایەتی) کە لە سلێمانی دەردەچوو بە شێوەی گۆڤارو رۆژنامە پاشکۆیەکی برایەتیش دەردەچوو لە ژێر ناوی(پاشکۆی برایەتی) کە تایبەتمەندی بەو شێوەیە

نووسراوە.

« برایەتی گۆڤارێکی سیاسی گشتی یە حەفتەی جارێک دەردەچێ» وەژمارە یەکی ئەم پاشکۆیە کە بە ٨ لاپەڕە دەرچووەو نرخەکەشی ٢٠فلس بووە لە رێکەوتی ١٩٧١/٤/٢٣ لە چاپخانەی ژین لە سلێمانی چاپکراوە و دوا ژمارەش کە ژمارە(١٢)یە لە رێکەوتی ١٩٧١/٨/٢٩دەرچوو بێ ئەوەی ناوی خاوەن ئیمتیاز یان سەرنووسەری لەسەر نووسرابێ.

**خولی دووەم ـ قۆناغی سێیەم**

پاش ئەوەی ١٧ ژمارە لە حەفتەنامەی برایەتی لە سلێمانی دەرچووە و وابە پێویست زانراو، کە دەرچوونی رۆژنامەکە بگوازرێتەوە بەغدا لە بەر چەند هۆکاری هونەری و سەرپەرشت کردنی راستەوخۆ لەلایەن سەرنووسەرەوە کە مامۆستا دارا تۆفیق بوو کە ئەو کاتە سەرنووسەری رۆژنامەی (التاخی)ش بوو لە بەغدا، ئەوەبوو جارێکی دیکە (برایەتی) وەکو رۆژنامە دەستی بەدەرچوون کردۆتەوەو کە ژمارە یەکی لە١٩٧٢/٥/٢٦ لە بەغدا شەقامی (الرشید)دەردەچوو ، لە چاپخانەی (التاخی) چاپ دەکرا ولەو قۆناغەدا ٨٢ ژمارەی لێ دەرچووە بە بەردەوامی تاکو رۆژی١٩٧٣/١٢/٢٨ و برایەتی پێی نایە قۆناغێکی تازە کە باسی لێوە دەکرێ.

**خولی سێ یەم:**

خولی یەکەمین رۆژنامەی رۆژانەی کوردی لە مێژووی رۆژنامەگەری کوردیدا

برایەتی لەو خولەدایێ نایە قۆناغێکی گەورە لە مێژووی ژیانی رۆژنامەگەریی کوردیدا ئەویش بوونی بە رۆژنامەیەکی رۆژانە بۆ یەکەم جار ئەو شەرەفەش بەر پارتی دیموکراتی کوردستان کەوت کەبە کۆشش براو مامۆستای داهێنەرمان دارا تۆفیق کە ئەوکاتە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی و سەرنووسەری هەردووڕۆژنامەی «التآخي» و« برایەتی» بوو توانرا بۆ یەکەم جار بڕیاری دەرچوونی برایەتی بدرێ بە شێوەیەکی رۆژانە کە بابەتی سەردکی نووسینەکەی کاک نەژادی عزیز سورمێ یە:

* ژمارە سفری برایەتی لەم خولەدا رۆژی ١٩٧٤/١/١ گەیشتە دەست خوێندەوارانی کورد.
* ژمارە یەکی رۆژی١٩٧٤/١/٨ دەرچوو.
* ژمارە ٢٦ی وەکو دوا ژمارەی ئەم قۆناغە گرنگە رۆژی ١٩٧٤/٢/٧ بلاوکرایەوە پاش ئەوەی بە فەرمانی وەزیری راگەیاندنی حکوومەتی مەرکەزی راگیرا بەبەهانەی ئەوەی رۆژنامەکە ئیجازەی رۆژانەی وەرنەگرتووە، وپاش ئەوەی دوا ژمارەی رۆژانەی دەرچوو هەوڵ و کۆشش بەردەوام بوو لەگەڵ لێپرسراوانی راگەیاندنی حکوومەت بۆ ئەوەی برایەتی بە شێوەی رۆژانە دەستێ بەلام بارودۆخی سیاسی ئەو رۆژگارە نەیهێشت ئەم ئەزموونە بایەخدارە سەربگرێ ئەوەبوو بۆ جارێکی دیکە برایەتی گەڕایەوە شێوازی دەرچوونی حەفتانە کە پێشتر دوا ژمارە ٨٢ لە١٩٧٣/١٢/٢٨ دەرچووبوو..بۆیە پاش راگیرانی بە شێوەی رۆژانە و گەڕانەوەی شێوازی حەفتانە جارێکی دیکە ژمارە٨٣ لە رۆژی ١٩٧٤/٢/١٦ پاش نۆ رۆژ بە٨ لاپە، بلاوکرایەوە ژمارەکانی دیکەش بەو شێوەیەو لەو مێژووەدا دەرچووە.

ژمارە٨٤ رۆژی ١٩٧٤/٢/٢٠ دەرچووە

ژمارە٨٥ رۆژی١٩٧٤/٢/٢٤دەرچووە

٠ ژمارە٨٦ ڕۆژی ٢/٣/١٩٧٤ دەرچووە کە دوا ژمارەی برایەتی بوو لەم خولەدا چونکە کارمەندانی ڕۆژنامەکە پەیتا پەیتا بەرەو کوردستان دەگەڕانەوەو پەیوەندیان بەریزەکانی شۆڕشەوە دەکرد چونکە باروودۆخەکە دیار بوو کە جارێکی دیکە پاش چوار ساڵ لە ڕاگەیاندنی ڕێککەوتننامەی یانزەی ئاداری ساڵی ١٩٧٠بەرەو هەڵگیرسانەوەی شەڕەجوو لە ئاکامیشدا برایەتی بە هۆی ئەم باروودۆخەوە لەدەرچوون وەستاو تا ماوەیەکی دوورو درێژ کە بریتییە لە١٩ ساڵ ٢/٣/١٩٧٤-٢/٣/١٩٩٣ لە ئاکامی ئەو سیاسەتەی کە بەرامبەر جوڵانەوەی ئازادیخوازی گەلی کوردستان پیادەکراو بەڵام برایەتی وەکو دەنگێکی ڕەسەن جارێکی دیکە هاتەوە کۆڕی ڕۆژنامەگەری کوردی کە بابەتی خولی چوارەمیەتی .

**خولی چوارەم ـ قۆناغی یەکەم:**

پاش ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی١٩٩١ باروودۆخێکی تازە هاتە کایەوە بە تایبەتی کە حکومەتی مەرکەزی ئیداراتی خۆی لە کوردستان کێشایەوە و بەرەی کوردستانی کە ئەوکاتە هەموولایەنە سیاسیەکانی سەری گۆڕەپانی کوردستان تێیدا لە ئامێز گرتبوو بە تێکڕایی دەنگ بڕیاری هەڵبژاردنی گشتی ڕاگەیاندن وەجارێکی دیکە چەند ڕۆژنامەو گۆڤارو هاتنە کۆڕی ڕۆژنامەگەری کوردی لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستانەوە خەبات حەفتانە بە زمانی کوردی جارێک وەبەزمانی عەرەبی جارێکی دیکە لەدەرچوون بەردەوام بوو بە هەوڵ و تەقەللای ئەو هەڤاڵانەی کە لەشەقلاوە جێگیربوون بۆ ئەم مەبەستە بەڵام دیسان سەرکردایەتی پارتی برایەتی بیرنەچووبوو. وەبیرۆکەی دەرچوونەوەی بە شێوەیەکی ڕۆژانە لەسەرەتادا وەکو بڕیارێک چەسپی بوو بەڵام هۆکاری دواکەوتنی بۆ ڕۆژی ٢/٣/١٩٩٣ چەندین ئاستەنگی هونەری و کەرەستەو پێداویستی چاپ بوو بەڵام جارێکی دیکە بە هەوڵ و کۆششی ئەم هەڤاڵانە توانرا یەکەم ژمارەی قۆناغی یەکەمی لە خولی چوارەم بەشێوەیەکی ڕۆژانە بکەوێتە بەردەست خوێنەدەوارانی کورد ڕۆژی ٢/٣/١٩٩٣ بوو بە هەمان بیرو هەڵوێستی جارانی کە خۆی لە پەیامی کوردایەتی دەبینێتەوە بەداکۆکی کردن لەو ئەزموونە تازەیەی کە بۆ گەلی کوردستان ڕەخسابوو.

* برایەتی خولی چوارەم بەسێ قۆناغ تێدەپەڕێ:-

قۆناغی یەکەم لە: ٢/٣/١٩٩٣ تاکو ٣١/١٢/١٩٩٤

قۆناغی دووەم:لە١٧/٢/١٩٩٥ تاکو ١٢/ ١٠/١٩٩٦

قۆناغی سێیەم: لە١٣/ ١٠/١٩٩٦ تاکو ڕۆژانی ئیمڕۆ

وەبۆ ئەوەی زیاتر ڕۆشنایی بخەینە سەر قۆناغەکانی ئەم خولە بە پێویستی دەزانین کورتە باسێک دەربارەی هەر یەک لەم خولانە بۆ خوێندەوارانی کوردی بخەینە ڕوو.

خولی چوارەم: قۆناغی یەکەم ٢/٣/١٩٩٣- ٣١/١٢/١٩٩٤ وەکو لەپێشەوە باسمان کرد ژمارەی یەکەمی ئەم خولە لە ڕێکەوتی ٢/٣/١٩٩٣کەوتە بەردەست.

* برایەتی لەم خولەدا لە ژێر تایتلی ڕۆژنامەکە نووسراوە ڕۆژنامەیەکی سیاسی ڕۆژانەیە پارتی دیموکراتی کوردستان دەری دەکا.

* خاوەنی ئیمتیازی بەڕێز جەوهەر نامق سالم و سەرنووسەری بەڕێز حبیب محمد کریم.

* برایەتی ئەم جارە لە هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان دەردەچێ.

* سەرنووسەری رۆژنامەکە لە مامۆستا حبیب محمد کریم وە گۆڕدرا بۆ نووسەری ئەم چەند دێرە کە لە رۆژی ٢٦/١٠/١٩٩٣ دەست بەکارە بەڵام لەبەر چەند هۆیەک ناوی مامۆستا حبیب محمد کریم ماوە تا ژمارە ١٨٦٦ رۆژی٧/٢/١٩٩٤.
* لەو خولەدا بەبەردەوامی ٥٣٣ ژمارەی لێ دەرچووە.
* ژمارەی (٢١١٥)ی رۆژی ٢٥/١٢/١٩٩٤ لەلایەن چەکدارانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان سووتێنرا لە بەردەم بانقی مەرکەزی هەرێم لەناو جەرگەی هەولێری پایتەخت.
* هەمان ژمارەی (٢١١٥) هەر لە هەمان رۆژی٢٥/١٢/١٩٩٤ بۆ یەکەم جار لە مێژووی رۆژنامەگەری کوردی چاپی دووەمی کەوتە بازارەوە.
* ژمارەکانی٢١١٦ لە٢٦/١٢/١٩٩٤و٢١١٧ لە٢٧/١٢/١٩٩٤و ٢١١٨ لە٢٨/١٢/١٩٩٤ لە باروودۆخێکی یەکجار زەحمەت دەردەچوو بەهۆی دەست پێکردنی جەولەی دووەمی شەڕ لەلایەن یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە.
* رۆژی ٢٩/١٢/١٩٩٤ چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە کە برایەتی تێدا چاپ دەکرا، کەوتە بەر شاڵاوی داگیرکردن لەلایەن چەکدارانی یەکێتییەوە.
* رۆژی ٣١/١٢/١٩٩٤ باڵەخانەی هەردوو رۆژنامەی (برایەتی و خەبات) لەلایەن یەکێتییەوە داگیرکرا سەرەرای دزینی سەراپای کەلوپەلو ئامێرەکانی کۆمپیوتەر و کاغەزو پێداویستییەکانی چاپ.

**خولی چوارەم قۆناغی دووەم١٧/٢/١٩٩٥-١٢/١٠/١٩٩٦**

پاش داگیرکردنی باڵەخانەی برایەتی پاشانیش داگیرکردنی هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستانی عێراق لەلایەن یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە شێوازی ئینقیلابێکی عەسکەری کارمەندانی برایەتی ناچاربوون روو لە هاوینە هەواری سەلاحەدین بکەن وهەر لە یەکەم رۆژەوە بە هەمان گیانی رۆژانی رابووردوو کەوتنەخۆ بۆ ئەوەی نەیەڵن برایەتی بێناز بێتەوە سەرەرای ئەو باروودۆخە سەختەی کە تێدا بوون بە هۆی ئەو بارە دەروونییەی کە تووشی ببوون کە چۆن بە بەرچاوی هەموان لایەنێکی سیاسی خەریکی ئەنجامدانی پیلانێکن بە شێوازی ئینقیلابێکی عەسکەری بۆلەباربردنی ئەو ئەزموونەی کە لە ئاکامی راپەرینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ و خەباتی دوورودرێژی بزووتنەوەی ئازادیخوازی گەلەکەمان هاتۆتە کایەوە. سەرەرای نەبوونی پێداویستییەکانی چاپ و ئامێری چاپ کردن چونکە ئەوەی هەبوو رۆژی ٣١/١٢/١٩٩٤ کەوتە بەر شاڵاوی دزی و تاڵان کردن کە بە بەڵگە لە ژمارەکانی دوایی ئەم خولە لە سەر لاپەڕەکانی برایەتی بڵاوکرایەوە. بەڵام ئەم ماوەیە زۆری پێ نەچوو و حاڵەتەکە گۆڕدرا بە هۆی سووربوونی کارمەندان و شەونخوونی یان و هەوڵ و تەقەلای بێ وچانیان بۆ دۆزینەوەی رێگە چارەیەک پاش ئەوەی کارمەندە دڵسۆزەکانی بەپێتا بەپێتا بەرەو شارۆچکەی سەلاحەدین دەهاتن بۆ ئەوە جارێکی دیکە خولێکی دیکەی دەرچوونی برایەتی لەتۆمارگای کاروانی رۆژنامەگەری کورد تۆمار بکەن و ئەوەبوو تەنها لە ماوەی ٤٣ رۆژدا توانرا برایەتی بگەڕێتەوە مەیدانی خزمەتکردنی پەیامی پیرۆزی کوردایەتی و ریسوا کردنی سووتێنەران و داگیرکەرانی باڵەخانەکە لە شاری هەولێر.

یەکەمین ژمارەی ئەم خولە رۆژی دووشەممە رێکەوتی ١٩٩٥/٢/١٣ بە ٨ لاپەرە بە ژمارە٢١١٩ لە هاوینەهەواری سەلاحەدین بلاوکرایەوە بۆ هەموو لایەکی کوردستان و بەگوڕوتینێکی قایم تر کەوتە گیانی ئەو لایەنەی کوردستانی بەرەو هەڵدێر دەبرد.

* ژمارە ٢١١٩ لە رۆژی١٩٩٥/٢/١٣ کەوتە دەست خوێنەرانی کورد.

* لە رۆژی١٩٩٥/٢/١٣ تاکو رۆژی١٩٩٦/١٠/١٣ کە دەکاتە ساڵێک و هەشت مانگ ٦٩ ژمارەی بە ٨١٦ لاپەرە لێ دەرچووە.

* بۆ یەکەم جار برایەتی بە کۆمپیوتەر (تنضید وتصمیم) بە کۆمپیوتەر دەکرا.

* لەسەرەتدا بە نامێری ریزوگراف چاپ دەکرا پاشان لە چاپخانەکانی دهۆک (کۆلیژی شەریعە، هاوار، چاپخانەی خەبات) چاپ دەکرا.

* هەر ژمارەیەکی لە میانی (٢٠٠٠-٢٥٠٠) ژمارەی لێ چاپ دەکرا.

* هەموو ژمارەکانی بە شێوەیەکی نهێنی دەگەیشتە شارەکانی هەولێرو سلێمانی.

* لەگەڵ دەرچوونی ژمارە ٢١١٩ تا کۆتایی ئەم خولە بابەتەکانی دەنێردرایە لەندەن ئەوجا لەوێش جارێکی دیکە چاپی لەندەنی لێ دەردەچوو.

* زۆربەی کارمەندانی کە لە هاوینەهەواری سەلاحەدین بوون کەوتنە بەر شالاوی ماڵ تالان کردن و دەرکردنی خێزان و کەسوکاریان بە هۆی بەشداریکردنیان لە دەرچوونەوەی برایەتی.

* سەرەرای باری سەختی ئەو رۆژانە پەیامنێرانی برایەتی لە هەموو بەرەکانی شەری داسەپاودا لە رووداوەکان ئامادە دەبوون و وەبەتەواوی رووداوەکانی ئەم بیست مانگەیان تۆمار کردووە.

* دوا ژمارەی ئەم خولە ژمارە ٢١٨٧بوو کە لە رۆژی١٩٩٦/٩/٢٧بلاوکرایەوە.

**خولی چوارەم - قۆناغی سێیەم:**

١٩٩٦/١٠/١٣ تاکو رۆژانی ئیمرۆ.

پاش ئازاد کردنی هەولێری پایتەختی هەرێم و چەندین ناوچەی دیکە لە هەرێمی کوردستان بارودۆخێکی تازە هاتە ئاراوە کە لە ئاکامدا دەرفەتێکی تازەی بۆ برایەتی رەخساند چ لە رووی سیاسی و زەمینە خۆشبوون چ لە رووی بوونی نامێرو پێداویستەکان و چاپخانە لە هەولێر بۆ ئەوەی جارێکی دیکە وەکو رۆژنامەیەکی رۆژانە بکەوێتە بازاری خوێندەوارو رۆشەنبیرانی کورد بە هەمان سیاسەتی جارانی ئەویش بە داکۆکی کردن لە گەرانەوەی شەرعیەت کە خۆی لە پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستان دەبینێتەوە، ئەوەبوو یەکەم ژمارەی رۆژانە لەم خولەدا بە ژمارە ٢١٨٨ لە رۆژی ١٩٩٦/١٠/١٣ کەوتەوە گۆرەپانی رۆژنامەگەری کوردی بە ٨ لاپەرە لەگەڵ پاشکۆیەکی هەفتانەی ئەدەب و هونەری کە رۆژانی پێنجشەممە لە هەموو حەفتەیەک دەردەچێت بەو هیوایەی کە بتوانین (برایەتی)مان لە خزمەت کردنی رێبازی پیرۆزی بزووتنەوەی ئازادیخوازی گەلی کوردستان بەبەردەوامی بهێلینەوەو جارێکی دیکە نەکەوێتە بەر شالاوی قەدەغە کردن و سووتاندن کە لە ماوەی ئەو ٣٠ ساڵەدا تووش هاتووە کە بووە بە مەدالیای شەرەف حساب کراوە لەلایەن دڵسۆزان و غەمخۆرانی وشەی پیرۆزی کوردی کە برایەتی وەکو یەکەمین رۆژنامەی رۆژانەی کوردی بەوپەری مەسئولیەتەوە لە ئامێز گرتووە.

## چەند زانیارییەکی گشتی

یەکەم:

مێژووی خولەکانی برایەتی

خولی یەکەم:

١٩٦٨/١١/٩-١٩٦٧/٥/٦

خولی دووەم:

١٩٧٣/١٢/٢٨_١٩٧٠/٦/١

خولی سێیەم:

١/١/١٩٧٤_٧/٢/١٩٧٤ رۆژانە

١٦/٢/١٩٧٤_ ٢/٣/١٩٧٤ حەفتانە

خولی چوارەم قۆناغی یەکەم:

١٩٩٤/١٢/٣١_١٩٩٣/٣/٢

خولی چوارەم قۆناغی دووەم:

١٩٩٦/١٠/١٢_١٩٩٥/٢/١٧

خولی چوارەم قۆناغی سێیەم:

١٣/١٠/١٩٩٦_

ناوی سەرنووسەرەکانی برایەتی

١. مامۆستای شەهید (سالح یوسفی) لە٦/٥/١٩٦٧_ ١٩/١١/١٩٦٨

٢. مامۆستا علی عبدالله ١/٦/١٩٧٠ _ ٤/٤/١٩٧١

٣. مامۆستای شەهید دلرا توفیق ٥/٤/١٩٧١_ ١١/٣/١٩٧٤

٤. حبیب محمد کریم ٢/٣/١٩٩٣_ ٢٦/١٠/١٩٩٣بەڵام ناوی بەڕێزی تا٦/٢/١٩٩٤ مایەوە.

٥. فەرهاد عەونی لە٢٦/١٠/١٩٩٣ _ ....

# «برایەتی»
# یەکەمین رۆژنامەی رۆژانە
# لەمێژووی رۆژنامەگەریی کوردی دا

## لێکۆڵینەوەو بیبلۆگرافیا

## ڕوانینی بەرایی

هەمیشە یادکردنەوەی ڕۆژی ڕۆژنامەگەریی کوردی بەداخەوە لای ئێمە قاوغێکی شکڵی وەرگرتووە، ئینجا لەهەر بارودۆخێکدا بووبێ، خۆشی دەبووایە هەر ساڵێک، یا بەلای کەمەوە هەر چەند ساڵ جارێ ڕۆژنامەگەریمان پێ ی نابووایە قۆناخێکی نوێ و هەندێک لەو هیوا و ئومێدانە هاتبانەدی کە لەم لاو لەولا لەسەر پەڕەی ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا ئوقلانەی بۆ لێ دەدرا.

باردکە بەوە گەیشتبوو کە ئەوانەی بە تەنگ ڕۆژنامەگەریی کوردییەوە بوون، هەموو جارێ لە ساڵڕۆژی ڕۆژنامەگەریی کوردی دا (٢٢ی نیسان) مەسەلەی دەرچوونی ڕۆژنامەیەکی (ڕۆژانە) یان لە پاڵ دەرچوونی بلاوکراوەو دەوریاتی تر بە پێویستیەکی قۆناخ زانیووە[1]..

بەلام ئاشکرایە دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە هی ئەوە نییە تاقە کەسێک، یا چەند کەسێک شانی بدەنەبەر... دەزگاکانی دەولەتیش لە کوردستاندا ئەگەر بەریان لێ نەگرتبێ، بێگومان ئەیان کردووە بەخەم... حزب و لایەنە سیاسی یەکانی کوردیش کە ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان هەلی ئەوەیان بۆ ڕێک کەوتبێ ڕۆژنامە دەربکەن بیریان لەوە نەکردۆتەوە لەپاڵ ڕۆژنامە عەرەبی یەکەی (زمان حاڵ) یان، هەوڵی دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە بدەن؟!! بەم ڕەنگە کارەکە هەروا ماوەتەوە.

ئەمڕۆ ڕۆژنامە هەر لە خودی خۆیدا بووە بە زانستێک، تەنانەت هێزێکو

---

(١) وەک پێویستی دەرکردنی بلاوکراوەیەکی هەمیشەیی بۆ مندالانی کورد بە کوردی...
سەیریش لەوەدایە کە ئەم مەسەلەیە لە ساڵانی حەفتاوە لە گۆڕێ یە!!

بەرچاو، کە دەورێکی بەرچاو و گرینگی لە هوشیار کردنەوەی کۆمەڵ و پێکهێنانی ڕای گشتی دا هەیە... ڕوویەکی دیاری ڕاگەیاندنە کە شان بە شانی خەباتی چەکدار لە بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکانی دنیادا دەڕێ دا بووەو لە شارستانیەتی نوێشدا بووە بە دیاردەیەک، لە پاڵ نادگار و سیمای تر ڕەنگی سەدەی بیستەمی ڕشتووە...

بەڵێ ڕاستە ڕۆژنامەگەریی کوردی بەدرێژایی مێژووی (ئەگەر زۆر لە مێژیش نەبێ) خەباتێکی سەخت و پڕ لە سەروەری هەیە، بەڵام نەبوونی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەش کەلێنێکی گەورەیە لەو مێژووە.

جیاوازی دەوری ڕۆژنامەی حەفتانەو گۆڤارو دەوریاتی تر و ڕۆژنامەی ڕۆژانەیش هەر بەجێ ی خۆی، پێویستی بوونی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە بەکوردی تەنانەت لە قاوخی مافی ڕۆشنبیریشدا جێبەجێ دەبێ چ جای ئۆتۆنۆمی!!

کەچی پاش تێپەڕینی ئەو هەموو ساڵانەیش بەسەر ڕاگەیاندنی ئۆتۆنۆمی! «بەرەسمی» لەلایەن حکومەتی عێراقەوە، لەپاڵ بوونی زیاتر لە شەش ڕۆژنامەی ڕۆژانەو بەدەیانی دیکەی حەفتانەو گۆڤاری هەمەلایەن و دەوریاتی تر (بە زمانی عەرەبی)، ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە (ئێستاشی لەگەڵدابێ) بەکوردی نی یە!! لە کاتێکدا تەکنەلۆژیای ئەلکترۆن کە هۆی دیکەی ڕاگەیاندنی وەکو ئێزگە و تەلەفزیۆنی بەرەو پێشتر بردووە، بە ڕادەیەک گەفی پێ لە ڕۆژنامەی چاپکراو دەکا بە ڕۆژنامەی ڕۆژانەیشەوە، بۆیە دەبینین لە تەواوی دنیایێ دا دەمێکە ڕۆژنامەکان لەم مەسەلەیە بەخۆکەوتوون و هەوڵ دەدەن لەبەرابەر لێشاوی ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژی یە کە هۆیەکانی ڕاگەیاندنیشی گرتۆتەوە مشورێک بۆ دوا ڕۆژی ڕۆژنامە بخۆن، کە بەرەوپێش بردنی هۆیەکانی گەیاندن و چاپ و بڵاوکردنەوە سیمای هەرە دیاری ئەو مشورخواردنەیانە.

لەم ڕوانگەیەوە پێم وایە دەرچوونی «برایەتی» کە لەم بابەدا مەبەستە، وەک ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە نیشانەیەکی دیارە لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی دا باوەکو لەو ئاستە پێویستەشدا نەبووبێ[٢].

---

(٢) لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بۆ ئەوەیش بکەم کە کەلێنێک ڕۆژنامەو گۆڤاری ترمان هەیە پێویستیان بە لێکۆڵینەوەو لێدوان هەیەو لەوانەیە لەم ڕووەوە لە (برایەتی) لە پێشترین، تەنانەت هەندێکیان لەوانە دەچێ لە چاپیش بدرێنەوە بەڵام دەرچوونی (برایەتی) بە ڕۆژانە وەک یەکەمین تاڵی کردنەوە لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردیدا بۆ مێژووی لەمە بەدوای ڕۆژنامەگەریمان پێم وایە شایانی سەرنج و لێکۆڵینەوەیە..
ئەم نووسینەش هەوڵێکە لەم ڕێگایەدا.

## دەسپێشخەرییەکی بەجێ... بەڵام!!

سەبارەت بەزۆر ئەگەران، هەر لە سالانی چلەوە بەدوا، بەتایبەتی لە عێراق دا وا باو بووە رووناکبیر و دەستەی پێشەنگ یاخود ئەنتلجەنتای کورد زیاتر لەوانە دەدیترا کە بە عەرەبی دەنووسن و دەخوێنەوەو زمانێکی ئەورووپی دەزانن، هەرچەندە لەم لاو لەولا رۆژنامە و گۆڤارو کتێبیش بە کوردی لە چاپدرابن.

بەلام ئەوانەی بروایان وابوو، پێ دەچێ زمانی کوردی یان نەک هەر کورت رۆ، بەڵکو ناسانیش دەهاتە بەرچاو و وایان دەزانی دەیزانن وتیایشی شارەزاو مەعلانن، کە راستی یەکەیشی بەو چەشنە نەبووە!!

زمانی کوردی، وەک زمانی هەر نەتەوەیەکی سەر زەوی زمانەو رێسا و رێزمانی تایبەتی خۆی هەیە، لەگەڵ ئەوەی بواری پەروەردەو گەشەکردنیشی هەمیشە لێ گیراوە ونەولاتریش!! لەچاو ئەو هەل و مەرجانەی بۆ زمانی ئەو نەتەوانەی دراوسێ ی کوردن و لەگەڵیدا دەژین و هەموو پێداویستیکیان بۆ رەخساوە، نەک هەر بوون و ماهیەتی خۆی پاراستووە، بەڵکو بەرەوپێشیش چووە.

لەپێشەوەی ئەو هۆیانەش بەبروای من خوێندن بووە بە زمانی کوردی کە ئەوسا لە قۆناخی سەرەتایی دا تێنەپەریوە... هەڵبەت بەچاوپۆشین لە چۆنیەتی پرۆگرامی خوێندن (ئەوساو ئێستاش...) بێجگە لەوە سەرچاوەی خۆ پێ گەیاندن و رۆشنبیریان لە رێگای زمانی عەرەبی یەوە بووە.

دیسان عەرەبی زمانی ئەتەوەی دەسەلاتدار بووە بەنیسبەت عێراق[٣]و دام و دەزگا و دامەزراوەکانی دەولەتیش بەعەرەبی بوون و بێجگە لەوەی کە عەرەبی زمانی قورئانی پیرۆزەو بە خەرمانەیەکی پیرۆزیشەوە دەورە دراوە... بە کورتی زمانێک بووە نابێ پێ وە دەست کەوتووە، بە پێچەوانەی کوردی کە رەنگە ناز برانی تێدا بووبێ!!

---

(٣) بێ گومان بەنیسبەت ئێران و تورکیایش، فارسی و تورکی بووە.

هەر ئەمەیشە وای نەک هەر لە خەڵکی خاکیی، بەڵکو زۆر رووناکبیر و رۆژنامەنووسی تەنانەت کوردیش»!!» کردووە بڕوایان وابێ دەرچوونی رۆژنامەیەکی حەفتانە، یا گۆڤارێکی مانگانە بە کوردی سەرو زیاد بێ! (٤)

ئیدی حاڵ بەو جۆرە بووە؛ جێی داخیشە کە وا بووەو هوشیاریی فەرهەنگی ئەوانە نەگەیشتووەتە ئەوەی بایەخی رۆژنامەیەکی رۆژانەیان بەزمانی کوردی لەبەر چاو بێ و بیری لێ بکەنەوە، لەکاتێکدا خۆیان خاوەنی مەسەلەکەبن، یا هەرچی نەبێ خۆیان بە خاوەنی بزانن، کەچی ئینگلیزەکان تەماشا دەکەی بۆ کاری پروپاگەندەی خۆیان هەرزوو، دوای گرتنی بەغدا دێن گۆڤارێک بە زمانی کوردی بڵاو دەکەنەوە (٥).

کردنی «برایەتی» بە رۆژانە کەپێشتر پاشکۆیەکی حەفتانەی رۆژنامەی «التآخی» بوو و پێشتریش گۆڤارێکی بەناو مانگانە بوو وەک وتمان نیشانەیەکی دیارە لە مێژووی رۆژنامەگەریی کوردی دا و دەسپێشخەرییەکی بەجێش بوو.

بەڵام دوای چی؟!

دوای ئەوەی زەمینەی لەبار تێک چوو بوو بوونی شەڕ دەکرا...

دەبوایە هەر دوای بڵاوبوونەوەی رێککەوتننامەکەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠ هەست بەم کەلێنە فەرهەنگی یە بکرابوایەو هەنگاوێکی بۆ بهاوێشترا بووایە(٦).

## هەل و مەرجی دەرچوون

---

(٤) لە سەرەتای ساڵانی حەفتادا رۆژنامە نووسێکی لاو، کەلە بەشە کوردی یەکەی رۆژنامەی یەکێک لە حیزبە سیاسی یەکاندا کاری دەکرد، داوای تەنەدێک لە رۆژنامەکەی دەکا بۆ نەقابەی رۆژنامەنووسان بە مەبەستی ئەوەی ببێتە ئەندام.

سکرتێری رۆژنامەکە، هەر چەندە کوردیش بووە، بەڵام کوردی یەکی بەو رەنگەی ئەزانیەوە پێ ی دەڵێ: کاکی خۆم بۆ تۆ نابێ چونکە تۆ بە کوردی دەنووسی ولە بەشە کوردی یەکە کار دەکەی، بەهەر حاڵ هەوڵ دەدەم بشوێنێکت بۆ خۆم، بەڵام بڕوایش ناکەم ببێ!!

(٥) لەم بارەیەوە بڕوانە: دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد -تێگەیشتنی راستی و شوێنی لە رۆژنامەنووسیی کوردیدا - بەغدا ١٩٧٧ ل١١٢.

(٦) «برایەتی» کە کرا بە رۆژانە، لەگەڵ ئەوەی لە ئاستی گەلێک رۆژنامەی دیکەشماندا نەبوو پێشوازیەکی بێ ئەزیری لێ کرا بە رادەیەک وای لە حکومەت کرد بە ئاگادارکردنەوەیەکی تایبەتی دای بخات وەک لە ئاگادارکردنەوەکەشدا هاتبوو بە بیانووی ئەوەی بەرمیی داوا نەکراوە رۆژانە دەربچێت (!!).

# (چاوپێداگێڕانێکی مێژوویی خێرا)

وەک وتمان «برایەتی» لە کاتێکدا کرا بە رۆژانە کە زەمینەی لەبار تێک چوو بوو... نەک هەر ئەوەندەش بەڵکو دەرکردنیشی پەلەپەلیەکی تێدابوو.

ئاوڕدانەوەیەک بەرەو ئەو کاتەی «برایەتی» تێدا کرا بە رۆژانە دەبینین هەل ومەرجێکی بەو رەنگە نەبووە تاقی کردنەوەیەکی وابە خۆیەوە ببینێ... لەلایەک زەمینەی رێککەوتنی نێوان شۆڕش و حکوومەتی عێراق تا دەهات بەرەو لەقین و رۆچوون دەچوو، لەلایەکی دی هێرشێکی راگەیاندن لەنێوان رۆژنامەی «طريق الشعب» و «التاخي» دا لە ئارادا بوو[٧]. کە بەداخەوە وەک دەبینین کارێکی زۆریشی کردە سەر ناوەڕۆکی ئەم تاقیکردنەوە کورتەیە، چونکە هاوکات لەگەڵ بوونی بە رۆژانە هێرشەکە زیاتر پەرەی سەندبوو و تۆختر ببوو.

وەکو لایەنی هونەریش، نە چاپخانەیەکی لە بارو پڕ بەپێستی بۆ مەیسەر کرابوو[٨]، نە ئەو کادیر و رۆژنامەنووسانەی کاریان تێدا دەکرد باوەکو نووسەریش بوون، بەڵام زۆربەیان لە دەرگای ئەدەبەوە هاتبوونە نێوکاری رۆژنامەنووسیی، لێرەشدا مەبەستمان لەوە نییە بڵێین ئەوەی لە دەرگای ئەدەبەوە بێتە نێو دنیای رۆژنامەگەریی، رۆژنامەنووس نی یە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێداویستی تەکنیکی و هونەری رۆژنامەیەکی رۆژانە دیارە کۆمەڵێک شارەزاو پسپۆری دەوێ.

کادیرەکانی «برایەتی» بێجگە لەوە زۆریان لەشوێنی دیکەش کاریان دەکرد،

---

(٧) بێ گومان ئەم باسەی ئێمە لێکۆڵینەوەیەکی رۆژنامەنووسی یە دەنا ئەم مەسەلەیە دەکرێ درێژەی پێ بدرێ.

(٨) تەکنیکی نوێ بەگوێرەی چاپخانە. لە ناوەڕاستی ساڵانی حەفتاوە هاتە عێراق، بۆیە دەبینین زۆربەی رۆژنامەکان بە لیتەرپریس چاپ دەکران. سوێندی رۆژنامەی (الثورة) ئاخێزم (زمانی حاڵی بەعس) کەبە ئۆفسێت چاپ کرابێ..

بێجگە لەوەیش چنینی پیت یا بە دەست بوو. یاخود بە لاینۆتایپ وەک ئێستاش کۆمپیوتەر و چنینی ئەلکترۆنی و چاپی ئۆفسێت ئارا بە بەربڵاوی نەبوو...

ئەمەش کاری هەندێکیانی بڵاوکردبوو، تا وای لێ هاتبوو ئەگەر بگونجێ بڵێین ببووبە (گۆشەخانە!!)، هەر کادیرەو گۆشەیەکی تایبەتی هەبوو، وەکو بار دەهاتە بەرچاو بەسەریەوە وا دەردەکەوت توانای هەڵگرتنی نەبێ، تەنانەت وەک زمان حاڵی حزبێک زۆر جار تەواو لە سیاسەتی حزبەکە لای داوە یا هەندێ لە کادیرەکانی سەربەستی نووسینیان لەو کاتەدا ئیستغلال کردووە، کە ئەمانەش هەمووی لە ئەنجامدا کاری کردە سەر شێوە و ناوەرۆکی رۆژنامەکە.

ئەگەر لەگەڵ دەرچوونەوەی «التآخي» دا، «برایەتی»یش بەرۆژانە دەربچووبووایە بێگومانم لەوەی شوێنێکی دیارتری لە مێژووی رۆژنامەگەریمان دەگرت، چونکە تەنانەت بەهۆی ئەو هەلومەرجەی رێککەوتنی ئازار دروستی کردبوو رۆژنامە عەرەبی یەکانیش ئازادی یەکی چاکیان لە بڵاوکردنەوەدا بۆ هاتبووە گۆڕێ، چ جای «برایەتی» کە زمان حاڵی حزبێک بوو رێککەوتنەکەی لەگەڵ حکوومەت دا ئیمزا کردبوو[9]. و نوێنەری شۆڕشی کورد بوو لە کوردستانی عێراقدا. لەگەڵ ئەو هەلومەرجە ناجوورەیشدا، «برایەتی» بەو چەند ژمارە کەمە وەک تاقی کردنەوەیەکی نوێ لە رۆژنامەگەریی کوردی دا، دەوری خۆی بینی و خوێنەری کوردی هەرچی نەبێ لە جیاوازی رۆژنامەی رۆژانە و حەفتانە باخەبەر کرد[10].

---

(9) کەدەڵێین (برایەتی) رۆژانە، مەبەستمان لەو (٢٧) ژمارەیەیە بە رۆژانە دەرچووە، دەنا (برایەتی) وەک رۆژنامەیەکی حەفتانەو پێشتریش وەکو گۆڤارێکی مانگانە هەر هەبووە لە رووبەکی ترەوە رۆژنامەی رۆژانە دیارە لە قۆناخی مافی رۆشنبیریشدا جێ بەجێ دەبێ چ جای ئۆتۆنۆمی.

(١٠) (برایەتی) وەک رەمزی دۆستایەتی دوو نەتەوە (کوردو عەرەب) کە سالمعایە پێکەوە دەژین ناوزەد کرابوو، بەڵام رژێمی شۆڤێنی دوای دەست پێ کردنەوەی شەڕ تەنانەت ئەو ناوەیشی پێ رەوا نەبینی، ئەوەبوو (التآخي) کرد بە (العراق)و (برایەتی)ش بوو بە (پاشکۆی عیراق)!.

### (١) هەواڵ:

**(سەرچاوەو چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ کردن و شێوازی بڵاوکردنەوە لە یەکەمین ناڵی کردنەوەی رۆژنامەیەکی رۆژانە بە کوردی).**

رۆژنامەگەریی نوێ واتە رۆژنامەگەریی هەواڵ.. رۆژنامە بەهۆی هەواڵەوە رای گشتی بنیات دەنێ، هەر هەواڵیشە تەوەری هەموو بە دواداچوون و پێشبینی و رای تاقە کەس و گشتی[11]. رۆژنامەی رۆژانەیەش هەر بە هەواڵ لە هی حەفتانە جیا دەکرێتەوە.

هەواڵ ئینجا (سیاسی، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری، یا ئابووری و... تاد) کۆڵەگەیەکی بەهێزە کە رۆژنامە بەردەوامی خۆی لەسەر رادەگرێ[12] تەنانەت لە رۆژنامەگەریی «بیستراو» و «بینراو»یشدا هەواڵ جێی تایبەتی و بایەخداری خۆی هەیە و وام دێتە بەرچاو لە رۆژنامەگەری دا، بەتایبەتیش رۆژنامەی رۆژانە هەموو بابەتەکانی تر لە کەناری بەربەرینەکانی هەواڵ دان. جا چ ریپۆرتاژ بێ یاخود ئەوەی پێ ی دەگوترێ چیرۆکی هەواڵئامێز، تەنانەت لاپەڕەکانی ئەدەب و هونەریش لە رۆژنامەدا لە رووباری هەمیشە تیژڕۆی هەواڵەوە دەخۆنەوە، ئەگەر چی لە ئەنجامدا دەڕژێنەوە هەمان رووباریش ...

ئێستا با بێین بزانین «برایەتی» رۆژانە سەرچاوەی هەواڵەکانی لە کوێ دا بوو و چۆنی مامەڵە لەگەڵ ئەو هەواڵانەدا دەکردن کە پێی دەگەیشتن و چۆنی بڵاودەکردنەوەو تا چ رادەیەک تێیدا سەرکەوتووبوو؟

**«برایەتی» لە سێ سەرچاوە هەواڵی وەردەگرت:.**

**یەکەم:** ئاژانسی دەنگ و باسی عێراقی (ئا.د.ع).

**دووەم:** رۆژنامە و گۆڤار و بڵاوکراوە عەرەبی یەکان، بەتایبەتیش رۆژنامەی

---

(١١) بڕوانە: دکتۆر حسنین عبدالقادر/ الصحافة کمصدر للتاریخ چ٢ قاهیرە ١٩٦٠ ل.

(١٢) دەربارەی پێناسی هەواڵ، زۆر رای جۆراوجۆر هەیە، بە نموونە (چارلس دانا) دەڵێت: هەواڵ ئەوەیە هەرچی جەماوەری بەر فراوانی خەڵک پێ ی گرینگ بێ و سەرنجی رابکێشێ.. یا (نۆرثکلیف)، کە پێ ی وایە ئەگەر سەگێک پێ بداتە ئادەمیزاد هەواڵ نی یە، بە پێچەوانەوە ئەگەر ئادەمی یەک پێی دایە سەگ ئەوە هەواڵە، بە واتا هەواڵ ئەوەیە شتێکی تازە بێ خەڵکی بورووژێنی.. بیروڕای دیکەش لە بارەی ناسینی هەواڵەوە زۆرن کە لێرەدا جێی باس نی یە..

«التـآخي» کە ئەویش بەدەوری خۆی هەر لە هەمان ئەو سەرچاوانەوە هەواڵی پێ دەگەیی.

سێهەم: پەیامنێرە تایبەتییەکانی خۆی و پەیامنێرەکانی «التـآخي» و دەزگـا و ڕێکخراوەکانی حزب. (پارتی دیموکراتی کوردستان ـ عێراق).

ڕۆژنامەگەریی کوردی بەشێوەیەکی گشتی ڕۆژنامەگەریی وتار بووە زیاتر لەوەی ڕۆژنامەگەریی هەواڵ بێ. بۆیە لە مەسەلەی مامەڵە لەگەڵ کردنی هەواڵدا سەیر دەکەین برایەتی چ لە هەڵبژاردن و چ لە دارشتنی هەواڵ دا ڕێبازێکی سەربەخۆ و تایبەتی نی یە، هەر ڕاستەوخۆ وەرگێڕانی عەرەبی یەکەیە لە هەندێ هەواڵی ناوخۆوە بترازێ کە ئەوانیش یا بایەخێکی ئەوتۆیان نەبووە، یا بایەخیان پێ نەدراوە.

شێوازی دارشتنی هەواڵەکانی دەرەوەیش تایبەتمەندیەکی تێدا نی یە چ وەک سەرچاوە یا وەک دەست بەجێ ی بڵاوکردنەوە. «برایەتی» هەر لە هەمان کۆشەنیگایشەوە دەیڕوانی یە هەواڵ کە ڕۆژنامە عەرەبی یەکان پێیان دەبینی! ئەمەش زیاتر بەهۆی نەبوونی سەرچاوەیەکی تایبەت بەخۆی بوو.

ئەو هەواڵانەی لە پەیامنێرەکانیشەوە بۆی هاتوون، زۆربەیان بەهایەکی ڕۆژنامەنووسیان پێوە دیار نی یە، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کە «برایەتی» وەک ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە وەکو پێویست پەیامنێری نەبووە[13].

بۆیە ئەو هەواڵانەی لە «برایەتی»دا بڵاوکراونەتەوە هەر ئەو هەواڵانەیە کە ڕۆژنامەکانی دی بە عەرەبی بڵاویان کردوەتەوە بەتایبەتیش ڕۆژنامەی «التآخي»[14].

لە شێواز و چۆنیەتی بڵاوکردنەوەشدا هەواڵەکانی «برایەتی» ڕەمەکی و هەروایی

(١٣) ژمارەی پەیامنێرەکانی تایبەت بە برایەتی لەناو وڵاتدا نە دەگەیشتە ژمارەی پەنجەی یەک دەست کە ئەمەش بۆ ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە زۆر کەمە..

لە دەرەوەی وڵاتیشدا پەیامنێری نەبووە... دیسان هۆیەکانی پەیوەندیش وەک ئێستا نەبوو (سیستەمی مایکرۆیف) لە شارەکانی کوردستاندا نەبوو. بە نموونە پەیامنێر لە هەولێر یا سلێمانی تا بەغدا پێکی وەردەگرت ناوی چاوی دەچوو!!

(١٤) لەگەڵ ئەوەشدا نووسەری ڕۆژنامە دەتوانێ لە دارشتن و شێوازی بڵاوکردنەوەدا واله هەواڵەکە بکا (وەکو لە (التاخي)یش وەرگرتبێ) سیمایێکی تایبەتی بداتێ.. بەواتا بیکوردێنێ..

بەڵام دیسان دەبێ ئەویش بڵێین بڵاوکردنەوەی هەواڵ لە هەمان ڕۆژدا نرخی هەیە کە بێ گومان لە ڕۆژنامەی حەفتانەدا ئەو نرخەی نامێنێ.

بوون، ئەمەش لە چاوپێداگێڕانێکی خێرای لاپەڕەکاندا دەردەکەوێ، چ وەک دەرخستنی هەواڵی گرینگ و گرینگتر و گرینگترین، چ وەک تایبەتێتیەکانیش، تەنانەت لە شێوازی بلاوکردنەوەشدا، وەک دانانی وێنە، یا دەرخستنی هەواڵێک بەهۆی کۆللەبی یا هەر شێوەیێکی تری پێوەند بە هونەری دەرهێنانی ڕۆژنامەنووسی یەوە.

لێرەدا جێی باسە هەواڵ رووپەڕێکی زۆری لە «برایەتی» دا گرتووەو بەو (٢٧) ژمارەیەی لێی دەرچووە (١٨٠) هەواڵی دەرەوەو (١٦٠) هەواڵی ناوەخۆی بلاوکردۆتەوە.

## (٢)مانشێت و سەروتار

«مانشێت» لە زمانی رۆژنامەنووسی دا دەکاتە تایتلی سەرەکی رۆژنامە.

«مانشێت» بایەخێکی تایبەتی لە رۆژنامەدا هەیە، بەتایبەتیش ئەگەر رۆژنامە رۆژانە بێ.

مانشێت هەمیشە پەیوەندی راستەوخۆی بە هەواڵەوە هەیە و هەر لە هەواڵیش دەردەهێنرێ، بەپێی گرینگی هەواڵەکە و پەیوەندی بە بەرژەوەندی گشتی یا سیاسەتی رۆژنامەکە، کە لە دێڕێک یا چەند وشەیەک هەواڵی پێ دەردەخرێ، بۆیە ئەو هەواڵەی دەکرێ بە مانشێت بێگومان شارەزایی و کارامەیی دەوێ.

خوێنەریش لە یەکەم چاوخشاندنی بە رۆژنامەو ئەوەی دەیبینێ و سەرنجی رادەکێشێ تایتلی سەرەکی «مانشێت»ە.

مانشێتەکانی «برایەتی» وەک سەرنج راکێشانی خوێنەر تارادەیەک سەرکەوتوون، بەلام وەک چرکردنەوەی هەواڵەکە لە قاوخی هونەری رۆژنامەنووسی دا بەو جۆرە نەبووە کە پێویستە... بەتایبەتیش لە دارشتن دا کە ئەمەش وەک وتمان پێوەندی بە دارشتنی خودی هەواڵەکەیشەوە هەیە، تەنانەت هەندێ لە مانشێتەکانی لە سێ دێری رەتکردووە[15] (؟!) کە ئەمەش بۆ تایتلی سەرەکی رۆژنامەیەکی قەوارە (تابلۆید)ی وەک «برایەتی» زۆرە.

لە شێوازی بلاوکردنەوەشدا «برایەتی» دەبینین پەیرەوی رێگا ناسای یەکەی

---

(١٥) بە نموونە: بڕوانە ژمارە(١)و(٤).

کردووەو مانشێتەکانی هەمیشە لەژێر تەرویسەدا[١٦] بووەو بەیەک ڕەنگیش چاپکراوە.

پەیڕەوکردنی ڕێگای ئاسایش ئەوسا باوبوو، ئێستا وا نی یە، گەلێک ڕۆژنامە بۆ زیاتر سەرنج ڕاکێشانی خوێنەرانی زۆر جار دوو تایتڵی دەبێ، هەندێ جا دەگاتە «سێ»، کە لەسەرو ژێری تەرویسەدا بەشیان دەکا، بەپێی گرینگی هەواڵەکە، ئەمەش لە کاتێکدا دەبێ کە دوویا سێ هەواڵی گرینگ هەبێ، وەک ئەوەی لە ڕۆژنامە عەرەبی یەکانی عێراق دا دەیبینین.

سەروتاری ڕۆژنامەیش کە وتاری سەرەکی یەتی و زیاتر لەلای ڕاستی لاپەڕەی یەکەمدا بە دوو ستوون یان زیاتر بلاودەکرێتەوەو سیاسەتی ڕۆژنامەکەی تێدا ڕەنگ دەداتەوە و هەمیشەیش بەبێ ناو دەبێ و زیاتر بۆ مەبەستی کارکردنە سەر ڕای گشتی یە بە ئاگادارکردنەوەی لە کەم و کوڕی و گرفتەکان، یا هوشیار کردنەو یا بۆ پاڵپشتی مەسەلەیەک یا ڕایەک دەبێ.

بەهۆی هێرشە ئیعلامیەکەی نێوان هەردوو ڕۆژنامەی «التآخي» و «طريق الشعب» کە لە پێشەوەشدا باسمان کرد، سەیر دەکەین سەروتارەکانی «برایەتی» زۆربەی زۆریان بۆ ئەو مەبەستە تەرخان کراوە[١٧].

هەر بەو هۆیەوە زۆربەی سەروتارەکان سیاسی ڕووتن و ڕەنگدانەوەی وەختی خۆیانن..

شایانی باسە لەو(٢٧) ژمارەیەی «برایەتی» ڕۆژانەدا تەنیا(١٦) ژمارەی سەروتاریان تێدایە!.

---

(١٦) تەرویسە: بەو ڕوویەڕە دەگوترێ کە لە سەرەوەی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەدایەو ناونیشانی ڕۆژنامەو تەولوی زانیارییەکانی دیکەی دەربارەی ڕۆژنامەکە تیا دەخرێتە ڕوو وەکو ژمارە و(ڕۆژ) و(ناوی خاوەن ئیمتیاز) و(سەرنووسەر)و تاد.

(١٧) بڕوانە بیبلۆگرافیای بابەتەکان.

## (٣) ریپۆرتاژی رۆژنامەنووسیی

ریپۆرتاژ لە گرینگی دا بۆ رۆژنامە بەتایبەتیش ئەگەر رۆژانە بێ لە دوای هەواڵەوە دێ، «لەو نووخستەیەشەوە دەست پێ دەکا کە هەواڵی تێدا تەواو دەبێ»[١٨]، چونکە ئەگەر هەواڵ وەڵامی شەش پرسیارە بەناو بانگەکە (کێ و چی و کەی و لە کوێ و بۆ) بداتەوە ئەوا ریپۆرتاژ وەڵامە بۆ پرسیارێکی سەرەکی ئەویش (بۆ؟)[١٩] واتە بۆ وابووە؟

هەر چەندە «برایەتی» لە بڵاوکردنەوەی ریپۆرتاژدا درێغی نەکردووە، بەڵام زۆربەی زۆری ریپۆرتاژەکانی لە شێوەی چاوپێکەوتن دان، بەو واتایەی ریپۆرتاژەکان ژمارەیەکی کەم نەبێ چارەسەرکردنێکی رۆژنامەنووسی یان پێوە دیار نی یە. ئەویش زیاتر ریپۆرتاژی جیهانین و کراون بە کوردی.

دیسان بە بەراورد لەگەڵ ئەو ریپۆرتاژانەی رۆژنامە کوردییەکانی ئەوسا بڵاویان کردووەتەوە، ئەگەر ئەوەی لێ دەرکەین کە «برایەتی» رۆژانە بووەو ئەو رۆژنامانە هەفتانە بوون وەک لایەنی هونەری پێشکەوتوو نەبوون، بەڵام وەک ناوەڕۆک سەرکەوتوو بوون.

دەبووایە «برایەتی» بەپێی ئەو شوێنەی لە رۆژنامەگەریی کوردی ئەوسا دا هەیبوو زیاتر دەوری چاودێری بەسەر دەزگا و کۆمپانیاکانی دەوڵەت و موڵکدارەکان ببینێ بەتایبەتیش لە کوردستاندا لەمەشدا بەریپۆرتاژی رۆژنامەنووسی رۆژنامەیەکی وەک «برایەتی» دەیتوانی بیان خاتە بەرچاوی جەماوەر، چونکە ریپۆرتاژ بەهۆی ئەوەی زیاتر پشت بە بەڵگە دەبەستێ و وێنەی لەگەڵدا دەبێ زیاتریش جێی بڕوا دەبێ.

بەنموونە «برایەتی» لەو (٢٧) ژمارەیەدا ریپۆرتاژێکی لەسەر مەسەلەی رۆشنبیری منداڵانی کورد بڵاونەکردووەتەوە کە ئێستاشی لەگەڵدا بێ سەرچاوەیەک یا گۆڤارێک یا بڵاوکراوەیەکی تایبەت بە خۆیان نی یە! یا دەربارەی گەشت و گوزار لە کوردستان دا و گیروگرفتەکانی و یا باری بژێوی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی نافرەتی کورد لە دێهاتەکاندا و بەراوردی لەگەڵ نافرەتی شار... یا مەسەلەی

---

(١٨) دکتور ابراهيم امام/ دراسات في الفن الصحفي ـ قاهيرة/ ل ٩٩.

(١٩) لەم بارەیەوە بڕوانە: پاکزاد محمد کریم/ رۆژنامەگەریی کوردی و رۆژنامەنووسی کورد/ چاپخانەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ/ ١٩٨٤.

خوێندنی کوردی، یاخود گیروگرفتی ڕۆشنبیری کوردی و لەسەرووی هەمووشەوە مەسەلەی گەمارۆدانی ڕۆشنبیری[٢٠] ... تاد.

بە بڕوای من ئەم کەلێنانە لە «برایەتی» ڕۆژانەدا زیاتر بەهۆی نەبوونی کادیری ڕۆژنامەنووسی یەوە بوو، ئینجا هۆی تر... چونکە ئەوەی هەبووە وەک وتمان لە ڕێگای ئەدەبەوە هاتۆوەتە ناو دنیای ڕۆژنامەگەریی و پەیامنێر و نوێنەرە ڕۆژنامەنووسی یەکانیشی وا دەردەکەوێ بەپێی پلانێکی تایبەتی دەستیان نەداوەتە کار، بەڵکو هەر یەکێکیان بەکەیفی خۆی کاری کردووە، کە لێرەشدا ڕادەی کامەرانیی و هوشیاری ڕۆژنامەنووسەکە دەوری خۆی هەیە لە دەرک کردنی بەو بابەتە گرینگانەی ڕۆژنامەکەی پێویستیەتی.

وەک چۆنیەتی بڵاوکردنەوەیش، سەبارەت بەوەی «برایەتی» (٨) لاپەڕەی قەوارە تابلۆید (قەوارە نیو ٢/١) بووە نەیتوانیووە ڕیپۆرتاژی تێروتەسەل بڵاوبکاتەوە کە هەندێ جار بابەتی (ڕیپۆرتاژ) هەیە هەڵدەگری دوو لاپەڕە بگری.

زۆربەی ڕیپۆرتاژەکان کورتن وەک زمانی دارشتنیش زیاتر لە بیری ڕاگوزاری نزیک دەبنەوە تا دارشتنی ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسی.

## (٤) لێکۆڵینەوەی سیاسی

ئەو لێکۆڵینەوانەی «برایەتی» لەو چەند ژمارەیەدا بڵاوی کردوونەتەوە لەدوو تەوەردان: تەوەرەی یەکەم ئەو لێکۆڵینەوانەن کە دەچنەوە ناو هەمان ئەو بابەتانەی بۆ مشت و مڕی نێوان ڕۆژنامەی (التآخي)و (طريق الشعب) تەرخان کرابوون.

بەداخەوە دەبووایە «برایەتی» وەک یەکەمین تاقیکردنەوە، لێکۆڵینەوەی سیاسی وایشی تێدا بووایە دیاردە جیهانییەکان شی بکاتەوەو قسەیان لەسەر بکات.

---

(٢٠) گەمارۆدانی ڕۆشنبیری: کلتوورێک کە سەبارەت بە زۆر هۆ دەست بەسەر لایەنی ڕۆشنبیری دا دەگرێ، مەرجیش نی یە ڕۆشنبیری وکەلتووری دەوڵەمەندتر بێ لە کەلتووری ئەوەکەی تر، بەڵام بە هۆی چەند ئەگەرێک ئەمەی بۆ مەیسەر دەبێ وەکو ئەوەی هۆیەکانی ڕاگەیاندن بە تایبەتی ئەوزگەو تەلەفزیۆن لەبەر دەستی خۆی دا دەبێ بەم شێوەیە جۆرێکی تایبەتی لە کولتوور و فەرهەنگ دەسەپێنێ کە لەگەڵ خواست وبەرژەوەندی یەکانی خۆیدا بێتەوە ڕێ لە گەشەکردنی ڕۆشنبیری وکەلتوورەکەی تر بگرێ.

**تەوەری دووەمیش:** ئەو لێکۆڵینەوانەن کە لە زمانی تر (بەتایبەتی عەرەبی) کراون بە کوردی.

هێشتا ئەم تەوەرەیە تارادەیەک وەک هەڵبژاردنی بابەتەکان لەتەوەرەی یەکەم باشترن.

بێگومان نووسینی (لێکۆڵینەوەی سیاسی) بۆ رۆژنامەیەکی رۆژانە بەزمانێک کە یەکەمین تاقیکردنەوەی بێ لە دەرچوونی بە رۆژانە شتێکی ئاسان نی یە... بۆیە من بەش حاڵ وەرگێرانی لەم بوارەدا بە کارێکی پەسەند دەزانم، بە مەرجێک لێکۆڵینەوەکان لەروانینێکی بابەتیانەو بە دواداچوونێکی زیرەکانەدا بن.

هەندێ پێیان وایە لەگەڵ بارودۆخی کورددا بێتەوە، بەڵام من وای نابینم، چونکە ئاشناکردنی خوێنەری کورد بە تاقیکردنەوەی گەلان بەرچاوی روناکتر دەکاتەوەو بەر پێ ی خۆی باشتر دەبینێ و هەنگاوی خێراتر هەڵدەنێ.

«برایەتی» چەند لێکۆڵینەوەیەکی دیکەشی بڵاوکردووەتەوە ئەوەی دەکرێ پێی بگوترێ «رۆشنبیری پارتایەتی»، کە دەچێتەوە خانەی لێکۆڵینەوەی سیاسی، لەمەشدا «برایەتی» بەرای من وەک زمان حاڵی حزبێک کارێکی پێویستی ئەنجام داوە.

لە شێوازی بڵاوکردنەوەشدا، لێکۆڵینەوە سیاسی یەکانی لە ئاستی پێویست دانین، بەتایبەتیش لەرووی بڵاوکردنەوەی وێنە و ئەخشەو ئامار و بەڵگەنامەی تر کە بێگومان لێکۆڵینەوە بە پێزتر دەکەن.

## (٥) ئەدەب و هونەر و رۆشنبیری گشتی

لەچاو ئەوەی ژمارەکانی «برایەتی» رۆژانە کە لە (٢٧) ژمارەی رەت ئەکردوە، ئەدەب و هونەر لێکۆڵینەوەی هونەری و ئەدەبی بەشێکی چاکی لاپەڕەکانی گرتووە، ئەمەش دیاردەیەکی تازە نی یە لە رۆژنامەگەریی کوردی دا. زۆربەی هەر زۆری رۆژنامە و گۆڤارەکانمان، بابەتەکانی تری هەر هەمووی بەلایەک بووە، ئەدەبیش بەلایەک.

«برایەتی» وەک رۆژنامەیەکی سیاسی رۆژانە، بە بەراورد لەگەڵ بابەتی دیکەدا، بابەتی ئەدەبی و هونەری زیاتر بڵاوکردۆتەوە، ئەوە ئەگەر ئەو بابەتانەیشی لێ دەرکەین کە دەچنەوە ناو رۆشنبیری گشتی.

لەو (٢٧) ژمارەیەدا (٧) لێکۆڵینەوەی ئەدەبی و(١٦) شیعر و(٦) چیرۆک و (١٤) لێکۆڵینەوەی هونەری و بابەتی دیکەی دەربارەی هونەری تێدایە[٢١]. بێجگە لەو پارچە پەخشانانەیش کە لە شێوەی بیری ڕاگوزاری دا بڵاوکراونەتەوەو بە بڕوای من زۆربەیان دەچنە خانەی ئەدەب لەوەی لە خانەی وتار یاخود کورتە وتاری ڕۆژنامەنووسی دا بن.

بەڵام «برایەتی» بایەخی بە ئەدەبی منداڵان نەداوە، دەبووایە بەلای کەمەوە حەفتەی لاپەڕەیەکی بۆ تەرخان کردبان، کەچی لەتەواوی ژمارەکانی تەنیا یەک چیرۆکی منداڵانی بڵاوکردۆتەوە[٢٢].

گرفتێکی تری ڕۆژنامەگەریمان بەتایبەتیش لەم بوارەدا کە بۆ ئەدەب و هونەری تەرخان دەکەن، بەدواداچوون و شی کردنەوەی هەواڵە نوێ یەکانی پێوەند بە ئەدەب و هونەرە کە هیچ بایەخی پێ نادرێ.

لاپەڕەکانی ڕۆشنبیری بام لە ڕۆژنامەیەکی سیاسیشدا بن پێویستە خوێنەرانی لە تازەترین هەواڵی ئەدەبی و هونەری با خەبەر بکا، نەک هەر ئەودیش، دیاردە تازەکانیش شی بکاتەوە و بیانخاتە بەر تیشکی لێکۆڵینەوەو لێ دوان، واتە چارەسەرکردنی ڕۆژنامەنووسیانەی هەواڵە ئەدەبی و هونەری و ڕۆشنبیری یەکان بەگشتی.

چونکە بڵاوکردنەوەی ڕووت و هەروایی کاری ئەدەبی وەکو شیعر و چیرۆک لە ڕۆژنامەدا و بایەخ نەدان بە بەدواداچوونی ڕۆژانەی هەواڵە ڕۆشنبیری یەکان و شیکردنەوەو لەسەر نووسینیان بۆ لاپەڕەی ڕۆشنبیری کاری پێکگەیشتن چاتر دەگەیێنێتە ئەنجام.

ئەمەش لە کاتێکدا بووە کە زۆربەی کادیر و ڕۆژنامەنووسەکانی «برایەتی» نووسەر و ئەدیب بوون و ئاگادار بوون لەوەی ڕۆژنامە و گۆڤارە عەرەبی یەکان لاپەڕە ڕۆشنبیری یەکانیان چۆن دەخەنە ڕوو، هەر بەنموونە ڕۆژنامەی (الجمهورية) و گۆڤاری(الاقلام)ی بەغدایی و چەندانی دی کە لە وڵاتە عەرەبییەکان دەردەچوون و دەگەیشتنە بازاڕەکانی عێراق.

---

(٢١) بڕوانە بیبلۆگرافیای بابەتەکان.
(٢٢) بڕوانە بیبلۆگرافیای بابەتەکان/ بەشی چیرۆک/.

## (٦) گۆشە و ستوونە بەردەوامەکان

گۆشەو ستوون چەشنێکە لە وتاری ڕۆژنامەنووسی سەرەتای سەرهەڵدانی ڕۆژنامە، لە قاوخێکی تردا دەبێ و ڕەگەزی بەردەوامی تێدا دەبێ.
دیان وتاری ڕۆژنامەنووسیی کەم وا ڕێک دەکەوێ ناوی نووسەرەکەی بەسەرەوە نەبێ، چەندی گۆشە و ستوونی بەردەوامە بەتایبەتیش لە ڕۆژنامەی ڕۆژانە هەمیشە یان ناوی هەر بەسەرەوە نی یە، یان ئەگەر ناوی بەسەرەوەیش بێ ناوێکی خوازراو یاخود کورت کراوی پێوە دەبێ[٢٣].
گۆشە و ستوونی بەردەوامیش سیمایەکی تایبەتی بە ڕۆژنامە دەدەن و پردی بەیەک بەستنەوەی هەردوو بەری ڕۆژنامە و خوێنەر دەبن.
شارەزایان گۆشەو ستوونی بەردەوام بە سەخترین هونەری نووسینی وتاری ڕۆژنامەنووسی دادەنێن..
ئەم جۆرە وتارانەیش هەمیشە لەژێر یەک ناونیشاندا دەبن، بەڵام دەکرێ ناونیشانی لاوەکیشیان هەبێ، بەپێی ئەو بابەتەی ڕۆژنامەنووس قسەی لەسەر دەکاو لێ ی دەدوێ. ئەو ڕۆژنامەنووسەی یا نووسەرەی [٢٤] نووسینی ئەم جۆرە گۆشانەی پێ دەسپێرێ، پێش هەم و شتێک دەبێ بە پێی ئەو گۆشەیەی دەینووسی (ئەدەبی یا هونەری یا ئابووری یا سیاسی یا گشتی... تاد) شارەزاییەکی تەواوی هەبێ، تەنانەت ئەگەرلە لایەنێک لەم لایەنانەش بنووسێ، پێویستە شارەزای لایەنەکانی تریش بێ، چونکە بەبێ شارەزاییەکی وا ستوونی بەردەوام لە ئاستی گۆشەکە دێتە خوارەوە.
بابەت زۆرە، ژیان هەمووی بابەتە بەتایبەتیش بۆ نووسەری ستوونێکی ڕۆژانە، نووسەر بە پێی ئاستی ڕۆشنبیریی خۆی دەتوانێ کەم بایەخ و بایەخدار لێک بکاتەوە.

---

(٢٣) زۆر جاریش ناوی تەواوی نووسەرەکەی بەسەرەوە دەبێ بە تایبەتیش کە نووسەرەکە بە ناوبانگ بێ، وەکو گۆشەکەی ڕۆژنامەنووسی میسری محمد حسنین هەیکەل (بصراحە) لە ڕۆژنامەی (الاهرام)ی قاهیریی دا یان گۆشەکەی ڕۆژنامەنووسی عەرەبی بە ناوبانگ لە «الشرق الاوسط» و «اخبار الیوم»ی میسری دا.
(٢٤) هەندێ جار مەرج نی یە ئەوەی نووسینی گۆشەیەک یا ستوونێکی لە ڕۆژنامەیەکدا پێ دەسپێرێ نووسەری ڕۆژنامەکە خۆی بێ، دەگونجێ نووسەرێک بێ لە دەرەوەی ڕۆژنامەکەدا.

لە شێوازی نووسینیشدا نووسەری (گۆشە) یا (ستوونی بەردەوام)، هەمیشە ئەو شێوە نووسینە هەڵدەبژێرێ کە لەگەڵ ناوەرۆکی بابەتەکەدا تێک دەداتەوە.

بێگومان داڕشتنی ئەو شێوەیەش بەندە بەڕادەی ڕۆشنبیریی و قەڵەمڕەوانی نووسەرەکەوە. زۆر نووسەری ئەم جۆرە هونەرە واتە (ستوونی ڕۆژنامەنووسیی) بەهێزی داڕشتن و سەرکەوتوویی یان لە هەڵبژاردنی بابەتەکانیان بایەخێکی ئەوتۆیان بەگۆشەو ستوونەکانیان داوە کە گەیاندوویانەتە ناستی وتارێکی چڕی ڕۆژنامەنووسیی، یا هەندێ جار پارچەیەکی ئەدەبی، بەڵام زۆریشیان بەهۆی پەلەیی نووسین و سنوورداری ڕۆشنبیریان و دەست کورتیان لە هەڵبژاردنی بابەتەکانیان، نەک هەر گۆشەکانیان کوشتووە بەڵکو هەندێکیان ڕۆژنامەکەشیان بە پەند بردووەو نووسینەکانیان تەنها سەفسەتەی بێ ناوەرۆک بووەو هیچیتر[٢٥].

«برایەتی» وەک ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانە بەزمانی کوردی و یەکەمین تاقیکردنەوە لەم بوارەدا لەچاو قەوارەی خۆی دەتوانین بڵێین بیوو بە (گۆشەخانە)[٢٦]!! تەنانەت ئەو گۆشانەیش کە زیاتر وەختی بە حەفتانە دەردەچوو بڵاوی دەکردنەوە، گواسترابوونەوە بۆی کە بە بڕوای من ڕۆژنامەیەکی وەک «برایەتی» بەرگەی ئەو هەموو گۆشانە ناگرێ و هەناسەسواری و بێن تەنگی بە لاپەڕەکانەوە دیارە، چونکە دیارە ئەم گۆشەو ستوونانە هەمیشە لەسەر حیسابی وتار و ڕیپۆرتاژی ڕۆژنامەنووسیی دیکەدا دەبن[٢٧].

بەم جۆرە گۆشە و ستوونە بەردەوامەکانی «برایەتی» لەوە دەرچوو بوون گۆشەو ستوون بن، بەڵکو بوون بە دیاردەیەک بۆی، بەڵام لەبەر ئەو هۆیانەی لەسەرەوە باسمان کردن دیاردەیەکی پاشقەبڕو سلبی.

ئەگەرچی هەندێکیان پێویستیش بوو بن، وەکو گۆشەی (ڕۆژباش) لە لاپەڕ یەکداو گۆشەی (جیهانێکی سەیر) لە لاپەڕە شەش، کە دەبووایە لە لاپەڕە (٨ بووایە و خەڵکی کوردستان داوا دەکەن لە لاپەڕە (٤) و یەک دوانێکی تر.

لەڕووی ناوەڕۆکیشەوە، زۆربەی ئەو گۆشانە لە هەڵبژاردنی بابەتەکاند سەرکەوتنێکیان پێوە دیارنی یە، تەنها بریتین لە ڕیزکردنی وشەو دەستەواژە

---

(٢٥) راستی ئەم مەسەلەیە گەڕانەوەیەکی تایبەتی دەوێ لە لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆدا کە زیاتر تیشک بخاتە سەر ئەم هونەرە لە ڕۆژنامەگەریی کوردی دا.

(٢٦) برایەتی بە قەوارەی تابلۆید وتەنیا بە (٨) لاپەڕە (١٤) گۆشەو ستوونی تێدایە!!!

(٢٧) هێرشی ڕاگەیاندنی نێوان ڕۆژنامەی (التآخي)و(طريق الشعب) کاری کردبووە سەر ناوەرۆکی ئەم گۆشانەیش. تەنانەت هەندێکیان هەر بۆ ئەم مەبەستە تەرخان بوون (؟!).

هیچیتر، هەندێ لەو گۆشانە شێوازی دەربڕینی دەستەواژەکان ناودرۆکی پێ داون وەکو (پەنجەرەی خۆر) و (بزمارێک) و (رایەک)و...تاد.
وەکی دی گۆشەی تری هەیە، چونکە هەر جارەی نووسەرێک نووسیوویەتی بەرچاوترن و هێزێکیان پێوە دیارە، لێرەدا دێینەوە سەر ئەوەی بڵێین لە نووسینی گۆشە یا ستوونێکی بەردەوام لە ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەدا کارێکی ئاسان نییەو بە هەموو نووسەرێک بەڕێوە ناچێ. چونکە بەردەوامی نووسین لەپاڵ ڕۆشنبیری و ئاگاداریەکی چاکی نووسەر، بەدواداچوونێکی بەردەوامی نووسەرەکەیشی دەوێ، ئەمەیش وەک دەبینین لەزۆربەی نووسەری گۆشەکانی (برایەتی) دا بەدی ناکرێ، بەتایبەتیش ئەگەر بزانین زۆربەیان کاریان لە ڕۆژنامەی تریشدا دەکرد و ئەو بوارە ئەبارەیان نەبوو شتێک بخەنە ڕوو لە ئاستی هەل ومەرجی ئەوسادا بێ. یان ئەکێک لە گۆشەکان بووبێ بە نیشانەیەکی دیار بۆی وەکو لە ڕۆژنامەگەریی ئەو ئەوروبەرانەدا هەیە، بەتایبەتیش ڕۆژنامەگەریی عەرەبی.

## (٧) کولتوورو مێژوو

دابەشکردنی لاپەڕەکانی «برایەتی» وا دیار نی یە بەپێ ی پرۆگرامێکی تایبەتی وبێ، چونکە ئەگەر وابووایە، دەبووایە بەلانی کەمەوە ئەگەر حەفتەی جارێکیش وایە لاپەڕەیەکی تایبەتی بۆ کەلەپوورو مێژووی کورد تەرخان کردبووایە، چونکە گە لەوەی مێژووی کورد لە ڕووی بلاوبوونەوەی لە ڕۆژنامەگەریی کوردی دا ەبارەت بە زۆر ئەگەزان هەژارە و لە ئاستی پێویستدا نەبووە، خستنەڕووی ەنەکانی ئەو مێژووەو لێکۆڵینەوەو لێدوانیشی لە «برایەتی» دا بواری زیاتر و ل ومەرجی بۆ ڕەخساوتر بوو بەو هۆیەی زمان حاڵی حزبێک بوو کە نوێنەری ڕش بوو لە کوردستانی عێراق دا، ئینجا مێژووی کۆن و نوێ.
:یسان کوردستان لانەکەی یەکەمین شارستانیەتی ئادەمیزاد بووە تەنانەت لە خەکانی پێش مێژووشدا دەورێکی گرینگی هەبووە لە بنیاتنانی شارستانیەتی ڤایەتی دا، شوێنەواری هەموو چاخەکانیشی تێدا ماوە کە بەداخەوە «برایەتی» ڕیپۆرتاژێکی ڕۆژنامەنووسیش دا باسی نەکردوون.

تەواوی ئەو بابەتە مێژووییانەی لەو ماوەیەدا «برایەتی» ڕۆژانە بڵاوی کردبێتەوە تەنیا دوو وتارە [٢٨] کە یەکێکیان تەنیا وتارێکی ڕۆژنامەنووسیی سەر پێ بێ و بەس [٢٩].

## (٨) ڕێنووسی کوردی لە «برایەتی» دا
## ( ئەو گرفتەی ئێستاش هەر ماوە)

زمانی ڕۆژنامەنووسیی کوردی، لە دوادواکانی سالانی پەنجاوە گۆڕانکارییەکی هەست پێکراوی بەخۆیەوە دیوە، ئێمە لێرەدا ئەگەر پێویستیش بێ ناتوانین بەجێ باسی زمانی ڕۆژنامەنووسیی کوردی بکەین لە ڕێگای ئەو (٢٧) ژمارەیەدا چونکە ئاشکرایە کە «برایەتی» یش هەر لەتەودرەی ئەو زمانەدا بووە کە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردیەکانی دیکەی ئەوسا لەسەری ڕۆیشتوون و پەیڕەویان کردووە، وەک ئاشکرایشە کە گۆڕان و پەرەسەندنی زمانی ڕۆژنامەنووسیی بەندە بەگۆڕان و پەرەسەندنی کۆمەڵ خۆیەوەو لە وەچەیەکەوە بۆ ئەوی دی... ئەمەش بەڕۆژێک و دوان پێک نایێ... بۆیە لەم ڕووەوە ئەم باسە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی دەوێ چونکە ڕۆژنامە ئەگەر چی زمانی خۆی لە کۆمەڵەوە وەردەگرێ و بەپێی پەرەسەندنی کۆمەڵیش گەشە دەکا، هۆیەکی کاریگەرە لە بڵاوکردنەوەو چەسپاندنیشی لەنێ کۆمەڵدا.

ئێمە لێرەدا زیاتر باسی ڕێنووس لە «برایەتی»دا دەکەین:

لەبەر زۆر هۆ، خوێنەری کورد بەگشتیی پاشەگەردانی یەک لە ڕێنووسی کوردی دا دەبینێ. (هەر تیرەو لە کەنداڵێکە)، هەر کەسێ بەکەیفی خۆی دەنووسێ. ڕۆژنامەکانیش بێ ئەوەی پرۆگرامێکیان لەمەدا لەبەر چاو گرتبێ، یا بەلانی کەمەوە لە نێو ڕۆژنامەکە خۆی دا هەوڵی یەکخستنی ڕێنووسیان دابێ. بڵاویا کردۆتەوە، کە «برایەتی»یشیان لێ هەڵناوێردرێ.

«برایەتی» جگە لەوەی بایەخی بەم لایەنە نەداوە، لە زۆر ژمارە و وتاریشدا گرینگی بە دانانی سەر و بۆریش نەداوە، لە کاتێکدا بڕوا ناکەم چاپخانەی ئەو

---

(٢٨) بڕوانە ژمارە (٦ل ٣) وژمارە (٩ل ٣).
(٢٩) بڕوانە ژمارە (٢٦) ل ٨.

نەبووبێ ئەم کارەی پێ ئەنجام بدرێ... جا چونکە ئێمە بە پیتی عەرەبیش دەنووسین[٣٠] بۆیە دانانی سەرو بۆر جگە لەوەی زمانەکەمان لە دەربڕینی راستی خۆی نزیک دەکاتەوە، بەهاییکی جوانیشی پێ دەبەخشێ و ئادگارێکی تایبەتیشی دەداتێ.

ئیتر «برایەتی»یش وەک رۆژنامە و گۆڤارەکانی تری ئەوسا، هەمان پاشەگەردانی تێدایە و هەر نووسەرەی بە رێنووسی پەسەندکراوی خۆی نووسیوویەتی [٣١].

لە خاڵبەندیشدا بەڕێوەبەری لاپەڕەکان بەتەنیا خوێندەنەوەیەکی وتارو بابەتەکان دەیانتوانی چارەسەری بکەن، سەیر دەکەین چارەسەریان نەکراوەو رستەو دەستەوڵژەی زۆر لە وتارو هەواڵەکان تێکەڵ بوون، بەرادەیەک زۆریان لەماناو مەبەست دوور کەوتوونەتەوە.

ناچارین لێرەشدا دووبارەی بکەینەوە، دەرکردنی رۆژنامەیەکی رۆژانە بە کوردی، بەتایبەتیش کە یەکەم تاقیکردنەوەی بێ پێش هەموو شتێک پێویستی بە کادیری رۆژنامەنووسی یە، چونکە تاقی کردنەوەی دەرکردنی رۆژنامەی حەفتانە و مانگانەو هی تر هەرگیز بەس نی یە بۆ ئەوەی کە ئێمە دەتوانین بەهەمان گوڕوجۆش رۆژنامەیەکی رۆژانەیش بلاوبکەینەوە.

## (٩) لاپەڕەی وەرزش و لاوان

لەسەیریش سەیرترە... رۆژنامەیەکی رۆژانەی کوردی رۆژی ئەگەر چەند ستوونێکیش بێ بۆ وەرزش تەرخان نەکا... لە کاتێکدا زمان حاڵی حزبێک بێ و رێیەکی سەرەکی راگەیاندنی.

وەرزش لە رۆژنامەگەریی هەموو دنیادا بێجگە لەوەی رۆژنامە و گۆڤار و هەوریاتی تایبەتی خۆی هەیە، لە رۆژنامە سیاسییەکانیشدا بایەخی بەرچاوی خۆی

---

(٣٠) لە رێککەوتنامەی ١١ی ئازاری ١٩٧٠دا هاتووە کە زمانی کوردی زمانی رەسمی بێت لە کوردستان، بەڵام (بە نووسینی ئێستای)!! واتە بە پیتی عەرەبی!

(٣١) هەر چەندە لە دواداوکانی ساڵی ١٩٨٨دا، دەستەی کورد لە کۆڕی زانیاری عێراق سیمینارێکی بۆ ئەم مەبەستە رێکخست وناميلكەيەكيشی لەم بارەیەوە بلاوکردەوە کە ئەنجاری یەکخستنی رێنووسی تێدا خرابووە روو.. بەڵام هیچ کام لە رۆژنامەو گۆڤارو بڵاوکراوەکانی دیکەمان لەسەری نەڕۆیشتن وگوێ یان پێ نەدا!!

پێ دەدرێ.

دیسان دەبووایە بوونی چەندین ڕێکخراوی پیشەیی لە کوردستان دا وەکو قوتابیان و لاوان و ئافرەتان و... تاد[٣٢] ببووایە بە هۆی ئەوەی ڕۆژێ نیو لاپەڕە بۆ وەرزش دابنرێ.

لە تەواوی ئەو (٢٧) ژمارەیەدا، لە وتارێک بترازێ کە بەناوی (کوردستان و وەرزش)[٣٣] کە ئەویش زیاتر لە لێکۆڵینەوە دەچێ، هەواڵێک یاخود ڕیپۆرتاژێکی وەرزشی ناوخۆ یا دەرەوە بڵاو نەکراوەتەوە!!

بەم جۆرە جارێکی تر دێینەوە سەر ئەوەی بڵێین کە دەرچوونی «برایەتی» باوەکو دەسپێشکەرێکی بەجێش بووبێ، بەڵام بەدەرنگەوە بووە، لەو کاتەدا بوو کە زەمینەی لە بار تێکچوو بوو.

بۆیە هەروایی و بێ پلانی لە دەرکردن دا بەڕاشکاوی پێوە دیارە.

## (١٠) جاڕدان و ڕاگەیاندنی بازرگانی و خزمەتگوزاری تر لە «برایەتی» ڕۆژانەدا

ڕاستە ڕۆژنامە کە جاڕ بۆ شمەکێکی بازرگانی لێ دەدا، یا ڕاگەیاندنێک بۆ دەوڵەت یا کۆمپانیایەک بڵاو دەکاتەوە، جگە لەوەی خزمەتگوزاری یەکە کە پێشکەشی خوێنەری دەکا، بۆ خۆیشی شتێکی پێ دەبڕێ، تەنانەت هەندێ ڕۆژنامە، هەر بەهۆی جاڕدان و ڕاگەیاندنی بازرگانی یەوە بەردەوام بوونی خۆ مسۆگەر دەکا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شتێک بەخۆی، خوێنیش بە مەعنا ئەوە ئەگەر چاو لە هونەری بڵاوکردنەوەی ئاگاداری و ڕاگەیاندنی بازرگانی بپۆشی کە «برایەتی» ڕەمەکی و هەروایی بڵاوی کردونەتەوەو زۆربەشیان ڕاگەیاندن دەوڵەتی.

هەر چەندە من لەگەڵ ئەوە دانیم ڕۆژنامە ئاگاداری و ڕاگەیاندنی بازرگانی هە بەدوایی بڵاونەکاتەوە... بەڵام ئەگەر ڕۆژنامە کە وا باوە لەژێر پاڵە پەستۆو فشار

---

(٣٢) ئێستاش لەگەڵدابێ خەڵکانێ هەن ڕۆژنامە تەنیا بە مەبەستی لاپەڕەی وەرزش دەکڕن.

(٣٣) بڕوانە ژمارە (٢٢) ل ٨.

کەم داهاتی دا پەنا بۆ راگەیاندن و جاڕلێدان دەبا، پێم وانی یە «برایەتی» ئەوەندە ناچار بووبێ کە هەر ژمارەی لاپەڕەیەک تا لاپەڕەو نیوێکی بۆ تەرخان بکات[٣٤] بەتایبەتیش ئەگەر ئاگاداری دەوڵەت بن، هیچ هونەرێکیشی لە بلاوکردنەوەدا بەکار نەهێنابێ خوێنەر بەلای خۆیدا رابکێشێ و تەنیا بەمەبەستی دەستخستنی دەرامەتێک بووەو هیچیتر!!

بلاوکردنەوەی ئەم جۆرە بۆ زانین و ئاگاداریانەش بێ گومان جێی بابەتی دیکەی پێویستی گرتووەو لە هەمان کاتیشدا بینی رۆژنامەکەی تەنگ کردووە.

من وای نابینم «برایەتی» ئەگەر ئەو ئیعلانانەی بلاونەکردبانەوە نەیدەتوانی دەربچێ، چونکە بەلای کەمەوە دەتوانرا بە بەشێکی بوجەی بۆ «التآخي» دادەنرا پڕ بکرێتەوە، دیسان شایەد ئەگەر هەر سووریش بوو لە بلاوکردنەوەی ئاگاداری، دەبووایە لە شێوەیەکی هونەری دا بووان، کە بلاوکردنەوەی (ئاگاداری) و جاڕلێدان) هونەرێکە ئێستا لە زۆربەی زۆری بەشەکانی راگەیاندن لە دانشگاکاندا دەخوێندرێ.

«برایەتی» کە ئەو ئاگاداری یە دەوڵەتیانەی بلاوکردووەتەوە دەبووایە بیر لە هەندێ لایەنی تریش بکاتەوە کە دەرژێنەوە ناو ئەو خزمەتگوزاری یە رۆژنامە پێشکەشی خوێنەری دەکا، بە نموونە بلاوکردنەوەی بەرنامەکانی رادیۆی کوردی بەغدا، یاخود تەلەفزیۆنی کەرکووک یا دەرمانخانە ئێشکگرەکان لە شارەکانی کوردستان دا، یا هەر لایەنێکی تر خوێنەر پێویستی پێ یەتی، بەتایبەتیش کە بۆ خوێنەری کورد ئەمە یەکەمین تاقی کردنەوە بوو رۆژانە رۆژنامەی (خەبەری) بە زمانی خۆی هەبێ.

دیسان پێشکەشکردنی ئەم جۆرە خزمەتگوزاریانە کەسایەتێک بە رۆژنامە دەداو هیچی وایش لە رووبەری رۆژنامە ناگرێ و خوێنەر زیاتر بەلای خۆیدا رادەکێشێ... چونکە رۆژنامە ئاشکرایە هەر ئەوەنی یە کۆمەڵێک وتار و بابەتی ئەدەبی بلاو بکاتەودو بەس، رۆژنامە هەموو توێژو چینەکانی کۆمەڵ دەیخوێنێتەوە... پێویستە بابەتەکانی بە چارەسەرکردنێکی رۆژنامەنووسیانەوە بلاو بکاتەوە.

بەداخەوە «برایەتی» ئەو لایەنانەشی بەگشتی فەرامۆش کردووە!

---

(٣٤) (برایەتی) لەو (٢٧) ژمارەیەی دا (٨٨) ئاگاداری بلاوکردۆتەوە، ئینجا وەرە ژماردنی قەوارەو ژمارەی لاپەڕەکانی (برایەتی) وئەو ئاگاداریانە بکە!!

## (١١) لاپەڕەی هەمەڕەنگ

لاپەڕەی هەمەڕەنگ یا بڵێین دوالاپەڕەی ڕۆژنامەکە کراوە بە عادەت بێ بە لاپەڕەی هەمەڕەنگ و بابەتی هەمەچەشنی تاڕادەیەک کورتی تێدایە، بە جۆرێک لە زۆر ڕۆژنامەدا بە دەگمەن نەبێ هیچ بابەتێک بەبێ وێنە یاخود قەڵەمکێش بڵاوناکرێتەوە... هەرچەندە هەموو ڕۆژنامەیەکیش پەیڕەوی ئەوە ناکا دوالاپەڕە بکا بە لاپەڕەی هەمەڕەنگ بۆ نموونە ڕۆژنامەکانی کوێت و لوبنان سەیر دەکەین دوالاپەڕە دەکەن بە لاپەڕەی پاشماوە لە پاڵ هەندێ ئاگاداری و یەک دوو هەواڵی بێ وێنە یاخود وێنەدار... یا ڕۆژنامەکانی ئێران وەکو (کیهان) و (اطلاعات) کە دوالاپەڕەیان بە هەواڵ و ئاگاداری و ڕاگەیاندنی بازرگانی پڕ دەکەنەوە.

چەندی ڕۆژنامەکانی عێراقە بە پێچەوانەوە دوالاپەڕەیان هەمیشە کردووە بە لاپەڕەی هەمەڕەنگ و بابەتی هەمەچەشنی تێدا بڵاودەکەنەوە، لە پاڵ ئەوەی گۆشەیەک یا دوو گۆشەی بەردەوامی تێدایە.

زۆربەی ڕۆژنامە کوردییەکانی عێراقیش تا ئێستا هەر هەمان شێوازیان پەیڕەو کردووە کە ڕۆژنامە عەرەبییەکان لە سەری دەڕۆن.

بۆیە دەبینین زۆربەی زۆری خوێنەرانی کاتی خوێندنەوە لە دوالاپەڕەوە پێدادێن!.

لام وایە هەروایش پەسەندترە، دوالاپەڕە هەمەڕەنگ بێ.

لەم ڕووەوە دوالاپەڕەی «برایەتی» لە هەموو لاپەڕەکانی دیکەی ڕێک ترو بەرچاوترە، تەنانەت وەک دەرهێنانی هونەریش. هەڵدانەوەیێکی خێرای ئەو (٢٧) ژمارەیە ئەوەمان بۆ دەردەخا، زۆربەی زۆری بابەتەکانی دوالاپەڕە بابەتی پڕ بەپێستن، تەنانەت ئەو گۆشە بەردەوامانەی کەوتوونەتە ئەم لاپەڕەیەش هەندێکیان وەک گۆشەی (ڕۆژمێری برایەتی) لە گۆشەکانی دیکەی «برایەتی» لە پێشترن، لەرووی هەمەڕەنگی بابەتەکانیش هەر بەو جۆرە، لە ڕیپۆرتاژی لێوەشاوەوە بگرە تا هەواڵ و بیری ڕاگوزاری و شیعری خۆماڵی و وەرگێردراو و هونەر و تەنانەت هێندێ کورتە لێکۆڵینەوەیش.

ئەمەش شتێکی ئاسای یە ئەگەر بزانین ئەم لاپەڕەیە بەر لە هەموو لاپەڕەکانی

تری رۆژنامە دەخوێندرێتەوەو لە گرینگی و بایەخیشدا دوای لاپەڕەی یەکەم دێت بەتایبەتیش لەرووی دەرهێنانی هونەری یەوە، بەڕادەیەک گەیشتووە بەوەی رۆژنامە هەیە تەروسەکەی تیا دووبارە دەکاتەوە، ئەگەر چی بچووکتریش بێ لە تەروسەی لاپەڕەی یەکەم، وەکی دی هی تر هەیە تەنها ناوی رۆژنامەکە دووبارە دەکاتەوە، بەڵام ئەختێک بچووکتر.

○

# چاپ و دەرهێنانی هونەری

جۆری چاپ هەمیشە کار دەکاتە سەر دەرهێنانی هونەریی رۆژنامە، جگە لەوەی کاری بەسەر ژمارەی لە چاپدانیشەوە هەیە[٣٥]، نەک هەر ئەوەش بەڵکو پێشکەوتنی رۆژنامە هەمیشە بە پێشکەوتنی چاپخانەوە بەند بووە.
بەکورتی: ئەگەر چاپی رۆنیوو فۆتۆکۆپی لێ دەرکەین کە لێرەدا مەبەست نییە[٣٦] سێ جۆر یا رێگای چاپ هەیە:
یەکەم: چاپی دەستچین، کە ئەمڕۆ بە دواکەوتووترین رێگای چاپ دەژمێردرێ و زۆر بە بەرتەسکی یەوە بەکار دەهێنرێ.
دووەم: چاپ بە (لاینۆ) یا (ئەنتەر) تایپ کە ئێستاشی لەگەڵ دابێ بەکار دەبرێ.
سێیەم: چاپی ئەلکترۆنی یا کۆمپیوتەر: کە پێشکەوتووترین رێگای چاپە[٣٧].
«برایەتی»: قەوارەی (تابلۆید)ەو بە ئەنتەر تایپ بابەتەکانی ریزکراوەو بە (لیتەریرێس) چاپکراوە... ئەم جۆرە چاپەیش باوەکو ئەگاتە چاپی ئۆفسێت و چنینی ئەلکترۆنی، بەڵام بێگومان لە چنینی دەستی پێشکەوتووترە.
لەم جۆرە چاپەدا، دەرهێنەری هونەری، ئەو ئازادی یەی نابێ لە راپەراندنی ئیش و کارەکانی وەک ئەوەی لە رێگای بە ئۆفسێت چاپکردن دا دەیبێ[٣٨] چونکە

---

(٣٥) چاپخانە پێشکەوتووەکان بە تایبەتی (ئۆفسێت) توانای، لە چاپدانی هەزاران دانەیان هەیە.

(٣٦) چونکە ئەم جۆرە چاپخانانە هەمیشە لە رووی ناچاری یەوە بۆ لە چاپدانی رۆژنامە یا دەورییاتی تر بەکار دێن، بە تایبەتیش حیزبە سیاسی یەکان کە ئەدەبیاتی خۆیانی پێ لە چاپ دەدەن بەرەی گواستنەوەو بەکارهێنانی ئاسانترە.

(٣٧) بۆ رێ روونی زیتر بڕوانە: ئەژاد عزیز سورمێ/پرۆژەیەک بۆ دەرکردنی رۆژنامەیەکی رۆژانە بە کوردی/گۆڤاری (رۆشنبیری نوێ) ژمارە (١١٢) بەغدا کانوونی یەکەمی ١٩٨٦.

(٣٨) بگەڕێوە سەرچاوەی سەرەوە.

قالبی پیتەکان سنووردارن و دوای چنینیش دەسکاری ناکرێ و لە پێداچوونەوەو راستکردنەوە (تصحیح)یش دا چارەسەرکردنی سەخت دەبێ. لەرووی بڵاوکردنەوەی وێنەو دانانی تایپۆگرافیا و هۆیەکانی جوانکاری تریش دا دەرهێنەر ئەو ئازادی یەی نی یە کە لەچاپی ئۆفسێت دا هەیەتی[٣٩]، ئەوە بێجگە لە ماوەی راپەڕاندن و لەچاپدانی رۆژنامەکە، کە لە چاپی ئۆفسێت دا زۆر زۆر کەمترە پاک و خاوێنی چاپیش لەم لاوە بوەستێ.

راستی ئەو کاتەی «برایەتی»یشی تێدا دەرچوو چنینی ئەلکترۆنی و کۆمپیوتەر هەر نەهاتبووە عێراق و چاپی ئۆفسێتیش بەو بەربڵاوی یە نەبوو کە ئێستا هەیە.

بۆیە ئێمە لەمەبەدوا کە باسی دەرهێنانی هونەری لە «برایەتی» دا دەکەین دەبێ ئەم خاڵەمان لەبەر چاو بێ.

**مەبەست لە (دەرهێنانی هونەری)**: دەرخستنی ئەو بابەت و نووسینانەیە لەسەر رووپەڕی رۆژنامەدا لەلایەن دەرهێنەری یا هونەرکارانی رۆژنامە کە دەستەی نووسەران پێشتر بڕیاری بڵاوبوونەوەیان داوە.

دەرهێنانی هونەریش بە دەوری خۆی بەندە بە سیاسەتی خودی رۆژنامەکە، مەبەستیش لە سیاسەتی رۆژنامە وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارەیە کە رۆژنامە چی بڵاودەکاتەوەو ئەوەی بڵاویشی دەکاتەوە چۆنی بڵاو دەکاتەوە[٤٠]، لە جۆری هەڵبژاردنی شوێنی بابەتەکانەوە بگرە تا قەوارەی پیتەکان و دەرخستنی بابەتێک کە سەر نووسەر یا بەرپرسیاری رۆژنامە پێی وابێ دەرخستنی پێویستە.

دیسان زۆر ئەگەریش هەن کار دەکەنە سەر دەرهێنانی رۆژنامە لەوانە وەک وتمان سیاسەتی رۆژنامە و سرووشتی چاپکراوەکە خۆی و چۆنیەتی چاپ و رادەی شارەزایی دەرهێنەر و هونەرکارەکانی تەنانەت جۆری ئەو کاغەزەی رۆژنامە بەکاری دەهێنێ[٤١].

لە حەقیقەتیشدا رۆژنامەگەریی عەرەبی لە عێراقدا، لەبەر گەلێک هۆ کاری کردووەتە سەر سیاسەتی دەرهێنان لە رۆژنامەگەریی کوردی دا.

---

(٣٩) جۆری چاپ کار لە مانشێت وناونیشان وتائیلە سەرەکی ولاوەکی یەکانیش دەکا.

(٤٠) بڕوانە: تۆماس بێری/ الصحافە الیوم/ل ٢٥٧.

(٤١) لە رووی کاغەزەوە سەیر دەکەین (برایەتی) جۆرێکی تەخلیدی بە کار هێناوە، ئەمەش لەوەدا دەردەکەوێ کە ئێستا لاپەڕەکانی هەڵدەدەینەوە هەڵدەوەرێ..

بێ گومان جۆری کاغەز لە هەموو بارەیەکەوە کار لە دەرخستن ودەرنەخستنی دەرهێنانی هونەری دا دەکات.

لەم بارەیەوە «برایەتی»یش لە رووی دەرهێنانەوە سیاسەتێکی تایبەت بە خۆی نەبووە، ئەگەرچی لە هەڵبژاردنی بابەت و دەرخستن و دەرنەخستنی بابەتێک ئەگەر پابەندیش بووبێ زیاتر بە «التآخي»یەوە بووە.

«برایەتی» لە بڵاوکردنەوەی بابەتەکاندا سیستەمی (ستوونی) بەکار هێناوە، کە ئەم سیستەمەیش وێنە و تایتڵ و بابەتەکان وەک پێویستە دەرناخا، لەگەڵ ئەوەشدا دەبینین لە هەندێ ژمارەدا هەوڵی داوە لە بەکارهێنانی سیستەمی (ئاسۆیش) نزیک بێتەوە.

لە بەکارهێنانی خەت و قەوارەی پیتەکانیشدا لە تایتڵە سەرەکی و لاوەکی یەکانیدا، «برایەتی» خەتیشی بەکارهێناوە پیتیش، بەتایبەتیش ئەوەی لای ئێمە بە (بۆڵد) ناسراوە کە دەکاتە قەوارەی (٢٠)ی رەش و سپی[٤٢] لە تایتڵی زۆربەی هەواڵەکاندا بەکارهێناوە.

دیسان هەر بەهۆی پەیڕەوکردنی سیستەمی ستوونی یەوە «برایەتی» مانشێتی لاوەکی تێدا نی یە، مەبەستیشمان لە مانشێتی لاوەکی دەرهێنانی رستەیەک یا چەند دەستەواژەیەک و دەرخستنیان لە بابەتێکی دیاری کراودا کە هەندێ جار کاکڵی بابەتەکەی تێدا کۆدەبێتەوە.

«برایەتی» کاریکاتێری هەر تێدانی یە!، وێنەو قەڵەمکێشی دیکەیشی لە لاپەڕەی دوایی و یەکەم بترازێ ئەو بایەخەی پێ نەدراوە.

مانشێت بەخەت نووسراوە، بەڵام لەچاو ئەو خەتەی مانشێتی (التآخي) پێ نووسراوە ئاسمان و رێسمانە. وەکی دی خەتی ناونیشان و تەرویسەی وەکو ناونیشان و تەرویسەی «التآخي»یەوە وا پێ دەچێ هەمان خۆشنووسی«التآخي» نووسیبێتی[٤٣].

بە شێوەیەکی گشتی «برایەتی» لەرووی دەرهێنانی هونەری یەوە ئەگەرچی لە ئاستی رۆژنامە عەرەبی و کوردی یەکانی ئەوسادا نەبوو بێ، بەڵام وەک یەکەمین

---

(٤٢) خۆی راستیەکەی (پۆینت ـPOINT)ـە، نەک (بۆڵد)، ئەمەش زاراوەیەکە بە گشتی بە پێودرو قەبارەی پیتی چاپ دەگوترێ نەک جۆرێکی تایبەتی، بۆ نموونە پیتی چاپخانە لە گەورەیی وبچوکی دا پێوەرو قەبارەی جیاجیای هەیە، واتە پۆینتی جیاجیای هەیە.. لەوانە (١٤و١٦و١٨و٢٠)ی رەش وسپی کەوا بزانم هەر ئەو (٢٠)یشە ئێمە پێ ی دەڵێین بۆڵد. (بڕوانە/ئەوژاد عزیز سورمێ/پرۆژەیەک بۆ دەرکردنی رۆژنامەیەکی رۆژانە بە کوردی گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژ ١١٢/ ١٩٨٦ل ٢٦٥).

(٤٣) لەو کاتەدا هونەرمەند محمد زادە خۆشنووس ودەرهێنەری هونەری (التاخي) بوو.

تاقی کردنەوە لە مێژووی رۆژنامەگەریی کوردی دا و هاوکات لەگەڵ هەل‌ومەرجێکی زۆر تایبەتی دا کە لەپێشەوە باسمان کردو جۆری چاپەکەی و رادەی شارەزایی کادیرەکانی[44] جێی سەرنج و تێڕامانە.

○

(٤٤) زۆربەی کادیرو رۆژنامەنووسەکانی برایەتی، وەک هەموو کادیرەکانی دیکەی رۆژنامەو گۆڤارە کوردی یەکان لە رێگای ئەدەبەوە بەسەر کاری رۆژنامەنووسی دا کەوتبوون...
هەرچەندە ئەمە بۆ گۆڤارێکی مانگانە یا رۆژنامەیەکی هەفتانە لەوانەیە تا رادەیەک ئاسایی بێ، بەڵام پێم وایە رۆژنامەی رۆژانە کەم وزۆر کادیری شارەزاو تایبەتی خۆی دەوێ.. سەرەرای ئەوەش کادیرەکانی برایەتی، ئەگەر لە رووی ناچاری یەوە بێ هەر هۆیەکی تر، زۆربان لە شوێنی دیکەش کاریان دەکردو کادیرو شارەزاییێکی پێت چنینیشمان لە چاپخانەدا نەبوو کە ئەمەش بە دەوری خۆی گەلێک جار دەرچوونی رۆژنامەکەی دواخستووە بە هۆی پێداچوونەوەوە کاری هەڵەچنی کە کرێکارە عەرەبەکان لە کاتی چنین دا دەیان کرد.. بەداخەوە دوای بەسەرچوونی ئەو ماوەیەش ئەم گرفتە چارەسەر نەکراوە!

## پەخش و بڵاوکردنەوە

هەرچەندی رۆژنامە پێشکەوتوو بێ و بەرێک و پێکی لەچاپ بدرێ ئەگەر بڵاوکردنەوەی تەواو نەبێ و لە وەختی خۆی دا نەگاتە دەستی خەڵک ئەو پەیامە ناگەیێنێ کە لێی چاوەڕوان دەکرێ [٤٥].

بەشێوەیەکی گشتیی نەک هەر رۆژنامەگەریی بەڵکو بەهۆی بێ بازاڕی و لە ئەنجامی دابەشکردنی کوردستان و بەرزبوونەوەی رادەی نەخوێندەواری و جیاوازی دیالیکتەکانی زمانەکەمان[٤٦] چاپکراوی کوردی تریش بڵاوبوونەوەو پەخش کردنیان سەخت و گەلێک جار ئەستەمیشە!

بەڵام دیسان دابەشکردن و بڵاوکردنەوەی رۆژنامەی کوردی بەند بووە بە باروزروفی سیاسی کورد و کارێکی زۆریشی تێ کردووە.

«برایەتی» لەچاو زۆر چاپکراوی دیکەی عێراقی لەبەر ئەو هۆیانەی سەرەوە بازاڕێکی بەرتەسکی هەبووە، بەڵام بەهۆی زروفی بابەتی ئەوسای عێراق بەگشتی و کورد بەتایبەتی، جگە لەوەی کە زمان حالی حزبێکیش بوو بازاڕی لە زۆر رۆژنامەو چاپکراوی تری ئێستا بەربڵاوتر بوو، تەنانەت هەندێ جار هەر هەمان رۆژە دەگەیشتە قەزاو ناحیەکانی کوردستانیش، بۆ رۆژی دوایش دەگەیشتە گوندەکان کە ئێستا ناسەواردیان نەماوە... لە لایەکی دی یەوە هەر بە هۆی ئەو بارو

---

(٤٥) بڕوانە ئەژاد عەزیز/پرۆژەیەک... (رۆشنبیری نوێ) ژ ١١٢/١٩٨٦ ل ٢٥٣.

(٤٦) بڕوانە دکتۆر عزالدین مستەفا رەسوڵ/حول الصحافە الکوردیە/چاپخانەی دار الجاحظ بەغدا/ ١٩٧٣ ل ١٦.

زروفەیشەوە، هەلی ئەوەی هەبوو بگاتە دەرەوەیش.
بەڵام هەڵەی زەقی لە بڵاوکـردنەوەی  برایەتی دا دەکـرا ئەوە بوو کـە لە هەندێ شوێن بەخۆڕایی دابەش دەکرا، لە کاتێکدا لە مەڵبەندی شارەکانی کوردستـان دا بەر نەدەکەوت.
ئەمن بەخۆم دابەشکردنی رۆژنامـەم (هەر رۆژنامـەیێ) بە خـۆڕایی پێ هەڵەیە، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی هەمیشە بکەوێتە دەستی خەڵکانێ هەر مەبەستیان نەبێ بیخوێننەوە، کە هی تریش هەیە بە پێچەوانەوە مەبەستییەتی دەستی بکەوێ و دەستی ناکەوێ.
بەگشتی مەسەلەی پەخش و بڵاوکردنەوەی رۆژنامە و چاپکراوی کوردی تەنیا بە دامـەزراندنی دەزگـایەکی تایبـەت بە بڵاوکـردنەوەی لە وێنەی (داری ودتەنی عێراق)یەوە چارەسەر دەکرێ کە هەموو پێداویستێکی بۆ مەیسەر بکرێ، وەک چۆن بۆ (داری ودتەنی) مەیسەر کرابوو.

○

## روانینێ دیماهی

بێ گومان هەر چەندە ئێمە کە هەز سەرەبابەتێکی لێکۆلینەوەکەمان بۆ شیکردنەوەی ناوەڕۆک تەرخان کردبوو، ئەگەر چی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆیش بوو بێت باسی سیاسەت و پەیڕەوی کردنی ئەو رۆژنامەیەمان کردووە، لێرەشدا بەڕاشکاوی یەوە ئەوە دووپات دەکەینەوە کە «برایەتی» لەبنەڕەتەوە کرابوو بە رۆژانە بۆ ئەوەی خزمەتی ئامانجی رەوای گەلەکەمان بکات. پێم وایە هەر وایش دەبوو، چونکە دەوری نیشتمانی (التآخي) وەک رۆژنامەیەکی خاوەن بیروڕای سەربەخۆ و پەیوەست بە ئامانجە رەوایەکانی گەل لای هەموان ئاشکرایە... دیارە کە «برایەتی»یش هەر لە ژمارە (٠)ەوە دەیویست لەسەر هەمان ڕێباز بڕوا... بەلام بەداخەوە (وەک لە پێشەوەیش ئاماژەمان بۆ کرد) بارودۆخی ئەوسا ئەو هەلەی بۆ نەرەخساند کە ئەو دەورە بە (تەواوی)ی ببینێ... جگە لە تەمەن کورتیشی کە هەر بە ساوایی (بێگومان نیشانە بەو دەورەی) زیندە بەچاڵ کرا.

بەلام «برایەتی» رۆژانە، یەکەم هەنگاو بوو... کۆرپەیەک بوو بە ژانێکی دژوارەوە لەدایک بوو، ئەگەر چی نەیان هێشت پێ بگرێ، بەلام نەشیان توانی لەباری ببەن.

«برایەتی» بە هەموو ئەزموونە تاڵ و شیرینەکانی یەوە، فێری ئەوەی کردین نەبوون و کەمی پسپۆڕی چاپ و کادیری رۆژنامەنووسی و بلاوکردنەوەو نەبوونی ئارشیڤێکی لەبار و گەلێ پێداویستی تر، ببێ بە نیشانە بۆ لەمەو دوای نەخشەدانانی رۆژنامەگەریان و لە تاقیکردنەوەی دەرچوونی دا فێرببین

ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی کوردی ئەگەر دەربچێ پێویستە لە کوردستان دا دەربچێ.
دەبووایە «برایەتی» لە کوردستان دەربچوو بووایە... لەگەڵ هەموو ئەمانەیشدا «برایەتی» نیشانەیەکی دیارە لە مێژووی ڕۆژنامەگەریی کوردی دا، بەوەی یەکەمین ڕۆژنامەی ڕۆژانەیە، ئەو نیشانەیەی کە جێ ی داخە بە درەنگەوەو لە زەمینەیەکی ڕۆچوو داکوترا.

*١. ئەم باسە لە کۆڕێکدا کە لایەن یەکێتیی نووسەرانی کوردستان/ لقی هەولێر ڕێکخرابوو لە شەقڵاوە، لە هۆڵی ئوتێلی میدیادا ڕۆژی ١٩٩١/٧/١٩ پێشکەش کرا.*
*کۆڕەکە لەلایەن ژمارەیەک لە ئامادەبووانەوە دان وستاندنی لەسەر کرا کە لەلایەن نووسەرەوە وەڵامیان درایەوە...*
*٢. باسەکە هەر لە ساڵی (١٩٨٥)ەوە دوا سکێچی وەرگرتبوو و بیبلۆگرافیایشی بۆ ڕێکخرابوو، ئەمەشم لە پەراوێزی دوو لێکۆڵینەوەی تر دەربارەی ڕۆژنامەگەریی کوردی کە لە گۆڤاری (کاروان) دا بڵاوم کردوونەتەوە ئاماژە بۆکردووە. کە بێگومان بڵاوکردنەوەی لەو کاتەدا مومکین نەبوو.*

*نووسەر*

# [1] تەواوی ژمارەکانی «برایەتی» ڕۆژانە بەپێ ی بابەتە بڵاوکراوەکان

کلیلەکان
ژ = ژمارە
ل = لاپەرە
و = وەرگێرانی
ئا = ئامادەکردنی
ن = نووسینی
... = بێ ناو

## • هەواڵەکانی دەرەوە

- ئەڵمانیا ئاواتەکانی نێرۆدای هێناوەتە دی/ ژ (١) ل٨
- ئەحمەد سیکۆتوری داوای رزگاری وڵاتە ئەفریقاییەکان ئەکات/ ژ (٢) ل٢
- ئەندامێک لە ئەنجوومەنی پیرانی ئەمریکا دەچێتە سعوودیە/ ژ (٣)ل ١١
- ئەمریکا هەرەشەی داگیرکردنی سەرچاوەکانی نەوتی عەرەبی ئەکات/ ژ (٤) ل٢
- ئیسرائیل پێنج شۆرشگێری فەلەستین ئەگرێت/ ژ(٤)ل٢
- ئەزڤێستیا: (ناتۆ) لەدوای بارە ئاڵۆزەکەی ئەم دوای یەوە بوو/ ژ (٥)ل٢
- ئەمریکا گرینگی بە دروستکردنی ساروخی زەمین بۆ ئاسمان ئەدات/ ژ (١٠)ل٢
- ئەسەد نوێنەرێکی خۆی دەنێرێتە واشنتۆن/ ژ (١٢)ل١
- ئایا نیکسۆن لە حوکمدا دەمێنێ؟/ ژ (١٥)ل١
- ئابووری بەریتانیا لە تێکشکاندایە / ژ (٢٠)ل١
- ئاڵوگۆری یەخسیرەکان لە ڤێتنام / ژ (٢٢)ل١

- ئایا شۆڕشگێڕانی لاوس و حکومەت رێک دەکەون / ژ (٢٤)ل١
- ئەوانەی کەشتی یە یۆنانیەکەیان فڕاند دەچنە لیبیا / ژ (٢٥)ل١
- بەریتانیا ئاگاداری هێزە سوپاییەکان ئەکات / ژ (١)ل١
- بەرزبوونەوەی نرخی زێڕ لە لەندەن / ژ (٢)ل٢
- بەریتانیا و مانگرتنی کانەکانی خەڵوز/ ژ٣ل١
- بەیەکاچوونی هێزەکانی سوریا و سەهیۆنی / ژ(٣)ل ١
- بێ ئیشی پەرە ئەستێنیت لە ئەڵمانیای رۆژئاوا دا/ ژ (٤) ل١
- بەیانی وەزیری دەرەوەی تەنزانیا ئەگاتە کوێت / ژ (٤) ل٢
- بریندابوونی پۆلیسێکی قوبرسی/ ژ (٥)ل٢
- بەریتانیا لە گێژاوی گیروگرفتێکی ئابووری توندا دەژێ/ ژ (٨) ل١
- بەرەی سویس بێ دەنگە/ ژ (١٢) ل ١
- بەندەرەنایکا سەر لە هیندستان ئەدات/ ژ (١٤)ل ١
- بریجنیف دەچێتە کوبا/ ژ (١٩) ل ١
- بەریتانیا لە گێژاوو گیروگرفتە ئابووری یەکانیدا نقوم بووە/ ژ (١٩) ل١
- بریجنیف لە کوبا گەڕایەوە/ ژ (٢٤) ل٢
- باری ئابووری بەریتانیا زیاتر ئاڵۆز بووە/ ژ (٢٥) ل١
- پێشانگای هونەرمەندێکی چیلی لە پەکین / ژ (٤) ل٨
- پێکهێنانی حکوومەتێکی تازە لە تورکیا / ژ (٧) ل ٢
- پراڤدا: نموت کار ئەکاتە سەر رژێمی سەرمایەداری/ ژ (٧) ل٢
- پەرەسەندی لەنگەری بودجەی بەریتانیا/ ژ (١٣) ل ١
- پەیوەندی ئابوری نێوان میسر و وڵاتە یەکگرتووەکان/ ژ(١٩) ل ١
- پەیمانی ئاشتی / ژ (٢٥) ل ١
- پەیوەندی کوێت و ماڵتا / ژ (٢٣) ل ١
- پۆمپید ڤ دەسکاری کابینەی وەزیرانی فەرەنسا دەکا / ژ (٢٣) ل١
- پاککردنەوەی نۆکەندی سویس / ژ (٢) ل١
- تاوانبارە سەهیۆنیەکان موحاکەمە ئەکرێن/ ژ (١)ل ١
- تەقینەوەی دوو بۆمبا لەناو شاری فنۆم پەندا / ژ (١) ل١
- تازەترین تیشکی بۆ فەحس کردنی ئەو منالانەی تازە لە دایک دەبن/ ژ (١)ل١
- تێکرایی مردن و لە دایک بوون / ژ (٣)ل٨

